ناوی کتێب: پێشبینیی لێزانە قەرەجەکە – ڕۆمان
نووسینی: عەبدولمەجید لوتفی
وەرگێڕانی: شوکور مستەفا
بڵاوکراوەی ئاراس– ژمارە: ٩٦٣
دەرهێنانی هونەریی ناوەوە: ئاراس ئەکرەم
بەرگ: مەریەم موتەقییان
چاپی دووەم، هەولێر – ٢٠١٠
لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان لە هەولێر ژمارە ١٧٨ی ساڵی ٢٠١٠ی دراوەتێ

لەم دواییـیـانەدا، کاتێ مـامـۆسـتـا عـەبدوڵەجید لوتفیـی کورد، ئەدیبی بەناوبـانگی بەعـەرەبی نووسم ناسـی، نە من هێنـدەم بە بەرەوە مـابوو چی وام بۆ پێ بکرێ، نە ئەویش ئەوەندەی پێ مابوو لە نوێژەنەوە تێ هەڵچێتەوە و پێدا بێتەوە. دەی جا چ بوو، پیاو بەپاشەڕۆکیشدا بگا هەرخۆشە، گوتی، ڕۆمانێکم هەیە، حـەز دەکەم بەکوردی بـخـوێندرێتـەوە، بەزمـانەکـەی خـۆم بناسـرێتـەوە. دیارە ئەم پیاوە هەر لە منداڵیرا هەستی کوردەوارییانەی ماتەی دابوو، بەڵام زۆر درەنگ گەیشت. لەم دواییـیـانەدا تەواو گەییبوو. ڕۆحی پێ دووگیـان بوو، ژانی هاتبـوویێ. خـۆشـە پیـاو بەغەریبی نـەمرێ، هەر کـاتێ ئاوەکیش کەوت نامـۆیی لە شـوانەیڵـەی خـۆی نەکـا و زوو مل بۆ قـەڵانگی بدا. بۆ نێـو گـەلە گـەڕانەوە خـۆشـە. ئەوی لە گـەلە دابڕێ گورگ دەیخـوا. بەئاوەکی ژیان بردنە سەریش خۆزگەم وەجەهەنم.

مـەبەسـتم لەو قـسـانە بەشـاخ و گـوێیـانە ئەوە نیـیە، ئەوەی مـامـۆسـتـا عـەبدوڵەجـیـد بەعـەرەبی نـووسـیـوە جـێی ڕێز و پەسن و شـانازی نیـیـە. نووسینەکانی مامۆستا لوتفی، هەموو شتی پڕوپوختە و بەهێز و پێز و دار و بار و ڕوختەن. ئەم ڕۆمانەی دەیخوێنییەوە، بەعەرەبی نووسیوە. بەبڕوای خۆی یەک لە شاکارەکانی بەهرە و هونەری ڕۆماننووسییەتی.

شوکور مستەفا

١

جوامێر چاڵێکی چکۆلەی لەبەر پێیدا هەڵکەند، ویستی نەختێ قووڵی کا، کە دڵی بەقــووڵاییــیــەکــەی داکــەوت مــژێکی درێژی لە جگەرەکــەی دا، لە پاشــان بەپاژنەی پێڵاوە لاستیکەکەی، کوژاندییەوە و قونکە جگەرەکەی هاوێشتە ناو چاڵەکەی بەر پێیەوە، بەبن خۆڵەوەی کرد و شاردییەوە.

خۆی عادەتی وا نەبوو. ئەمە یەکەم جار بوو وای دەکرد. کە جگەرەی زۆر کـێـشـابا قـونکە جگەرەکـانی دەکـوژاندەوە و لەو سـەر زەوییـە وشکەی تووڕ هەڵدەدان و پێـیـەکی پێدا دەنان و درێژەی بەکاری خۆی دەدا. کە لە کاریش دەسـتی بەر دەبوو کـەمـێ سـەری هـەڵدەبڕی، نیگای بەر هـەنیـیـەی ئەو کـێـوە دەکەوت کە ئەفسانە و پڕوپووچێکی زۆری لە دەور تەندرابوو و شتی سەیر و سەمەرەیان لەمەڕ دەگێڕایەوە.

کێوێکی تا بڵێی بڵێند بوو. سەبارەت بەترس و سامێکی، کە بەئەفسانە و پڕوپووچی لادێییـان لە دەوری تەندرابـوو، هێندێ جـار هـەیبـەت، هێندێ جـار کولۆڵی و خەمباری دای دەگرت.

لە نزیکەوە شـتێ لەبەر زارکی ئەشکەوتێکی تاریکدا دەبیندرا، لە گۆڕخـانە دەچوو، ســەرەڕای ئەوەی کــە گــۆڕخــانەی کــەس نەبوو، بەپێـی ئەفــســانە و پڕوپووچ بەگۆڕخانەی مردووێکی نەناس، کە لەو شوێنەدا کوژرابوو دەزاندرا.

ڕوحـیـانەتی شـەوانە، بەسـەر ناوچەکـەدا دەخـولایەوە، بەڕۆژیش کـەسـێکی بەسەر ترۆپک کەوتبا سزای دەدا. ئەم کێوە بەکەڵکی چی دێ؟ جوامێر ئەمەی لە دڵی خۆیدا چەند جارێ دووپاتە کردەوە. هاتبا ئەم کێوە لە شوێنەکەی خۆی نەبوایە، یا نەختێ کشابایە پاشەوە زەوی و زارە بەرتەسکەکەم پان و بـەرینتر دەبووەوە. ئەم کێوە بەکەش و فشێکی بەترەفەوە خۆی هەڵخستووە و زەوی و

زار ڕووت دەکاتەوە، خۆزی  لاکەوتبا، لاکەوتبا، کێڵگەکەی لەبری چوار دۆنم زەویی بەبەرد و چەو، کە بەهەزار ناری عەلی خەلەودانێکی هیچ و پووچی دەهێنا و خەلەودانەکەیش بەهەزار  شەڕەشەق بەشی خۆی و خێزانەکەی و هەردوو وڵاخەکان: هێستره نیوه بڕست لێ براوەکەی و مانگا دۆشەنییەکەی، کە چەوریی زستانی خێزانەکەی بۆ دابین دەکرد، دەبوو بەبیست دۆنم. هاتبا کێوەکە پاشەوپاش کشابایەوە و کێڵگەکە بیست دۆنمێ بەرینتر بوایەوە ئەوسا دەچووە ڕیزی دەوڵەمەندان و دوو جاش هێستری بەگوڕ و مانگایەکی تریشی دەکڕی.

لە پاشان خۆی لە قەپێلکی قەناحەت پێچا – چ پێویستییەکم بەو هەمووە هەیە؟ خێزانەکەم دەڵێی، چکۆلەیە، ئەوەندکۆکە زەوییەی بەش دەکا و سەروزیادیشیەتی. بێ لەوەش هاتبا، لە جیاتی ئەوە، کوڕێکیشم لەگەڵ هەردوو کیژە باشەکانمدا هەبوایە، بەڵام ناشکوری نەبێ، خوا نێرینەی نەدامێ، ئەویش ئیرادەی خۆیەتی، هاتبا دایکەش لە ناساخی بەدوور بوایە ئەویش لە کاروباری بەرەجووتەکەدا، وەک جاران یارمەتییەکی دەدام، دەبوو بەیاریکارم، بەڵام ئامینە دەبێ وەک کچەکەی ساڵح ئەفەندیی دراوسێیان، کە لە سەروبەندی پیریدا بردیە کن خۆی، لەناو شار پێکەوە بژین، ببێ بەفێرکار. بەڵام گەورەکەیان بەختی وای هێنا. دەبوو واز لە فێرگە بێنێ و بەخزمەتکردنی دایکە نەخۆشەکەیەوە بگلێ، کە زۆر جار وای لێ پیس دەکرد، دەیگەیاندە حاڵی گیانەڵڵا و سەرەمەرگ. گوتی، شەرمین کچێکی چاکە، وای بەپەسند زانی خوشکەکەی ببێ بەفێرکار، کە لە کن دەوڵەت بوو بەفێرکار، ئیتر پێویست بەوە ناکا پیاو لەوەندە پتر داوا بکا. جا ئێستا دەبێ خۆ ئامادەکەم، بگەڕێمەوە، پایزان ڕۆژ هەر لە خۆیەوە ئاوا دەبێ، دەترسم خێوەکەی چیا بۆرم لێ پەیدا بێ، دەستێ مەستێکم لێ بوەشێنێ، چیم لە ئازار بەخۆ گەیاندن داوە. هێسترەکە لە نزیک بەردێکی ڕەش ڕەشەوە، لەو بەردانەی ئاگرپژێن هەڵیان دەدەن، بەمێخسکەیەکەوە بەسترابووەوە و تێر و پڕ بۆ خۆی لەوەڕابوو، بەچاوی نیوە قووچاوەوە بۆرژابوو و خەونی دەدیت.

هەرچی مانگا بەشیرە دۆشەنییەکەیش بوو، کە سێ ساڵان لەسەر یەک گوێرەکەی بەمردوویتی دەبوو، بووبوو بە شتێکی شووم و بەدووم و دەبوا بەجۆرێ خۆی لێ قوتارکا، ئێستا قەڵەوە و بۆ زاین ئامادە و تەیارە، بێت و گوێرەکەیەکی تری لە بارچێ یەکراست بۆ لای قەساو.

مانگا سست سست بەلاپاڵەکەدا هەڵدەگەڕا، لە بەرماوە پووش و پەڵاشێ دەگەڕا خۆی پێ تێرکا، ئەمیش لەسەرخۆی چاودێریی هەنگاوهەڵێنانی دەکرد. بەوپەڕی دڵنیاییەوە دەیزانی خێوی چیاکە دەست لە بەستەزمانان ناوەشێنێ... دەبێ بگەڕێتەوە با نەختێ بەرەڵڵا کرێ. مانگێکی خشت، هێشتا زگی بەرز نەبووبووەوە، بێ وچان، شان بەشانی هێسترەکە زەوییان دەکێڵا. دوو دۆنم و نیوی، ڕژد ڕژد، دوو گاسنە وەرد درابووەوە. ئەمەش وەنەبێ ئەرکی سەرشانی مانگا بێ، بەڵام کە هێسترەکە بەناو ساڵدا چوو، ئیتر هەوجارِ بەکێشکردنی وەک هەڕەتی جارانی لە کێشدا نەبوو.

ئەو دۆنمەکەی تری، ئەو دۆنمەی لە مەزراکە مابووەوە، بۆ تووتن چاندنی تەرخان کردبوو. جوامێر وا ناوی دەرکردبوو کە تووتنەوانی هەرە چاک و لێزانی ئەو ناوچەیەیە. لە نیوە دۆنمێکدا چاکترین جۆری تووتنی دەچاند و زۆریش بەپەرۆشەوە بوو چاکترین داهاتی زەویی بەبرِشتی بەچەنگ کەوێ. ئەو تەنیا دۆنمە بۆ تووتن چاندن لەبارترین شوێنی زەوییەکەی بوو. خاکەکەی فشەڵ و بێ چەو و بەرد و خرِک بوو، بەم ڕۆژگاری هاوینە هەمیشە خەریکی ئەوەبوو پەینی هەردوو وڵاخەکانی بۆ خۆشە دەکرد و پەینی دەکرد.

ساڵی پار داهاتەکەی چاکی نەهێنا. نیوەی ڕاستی بەفیڕۆ چوو. ژەنگ بەجارێ لەو گەڵا ناسکانەی دا، تووشی بەڵەکییەکی کرد، دەتگوت بەخۆڵەمێشت نەخشاندووە. تووتنەکە بۆ خۆی تێداچوو و برِایەوە، سەرەڕای ئەوەش کاتێک ژەنگ لە کێڵگە تووتنەکەی حسێن لوتفوڵای دراوسێی دا. حسێنی بەگەڵ خۆ دا، چوون بۆ شار. چاوساخێکی دایەرەی کشتوکاڵیان هێنا، ئەسپاب و ئامێری نەخۆشی قرِکردنیان هێنا، بەڵام بێ سوود بوو.

چاوساخە پسپۆڕەکە هەر هێندەی پێ گوتن، کە گەڵا پرِوپوختە و بەهێز و

دار و بار ڕوختـەن. ئەم ڕۆمـانەی ژەنگدارەکـان لەبنەوە بچن و لە جـێگەیەکی دووریـان بســـــووتێـنن، ئـەوەش کــــارێکی بەئـەرک و ئـورک بـوو. دەبـوو ژنـە نەخۆشـەکەی بەتەنیا بەجێ هێشتبا و هـەردوو کیژەکەشی: شـەرمینی کارامە و ئامینەی بێ تاووتوان و خـۆی، گەڵاتووتنی ژەنگدار خـڕکەنەوە. گەڵاتووتنەکـان بـەشی زۆریـان وشـک هـەڵگەڕابـوون، چونـکـە کــــاتێکی ژەنگەکـــەی لـێ دان دەمەدەمی تووتن چاندن بوو، بەدرێژاییی مەزرا تووتنەکانی دیکە کۆمـەڵە گەڵا تووتنی ژەنگاوی کڵپـەی کرد و بڵـێسـەی ئاگر بەرزبووەوە. وەرزێر ئامۆژگـاری کران کە ئیتـر لەمەوپاش زۆریان ئاگا لـە زەوی و زاری خۆ بێ و چاکی وەرد و شــۆدەن، یا ئەوەتا چەند وەرزانـی لێ گـــەڕێن، چی لێ نەچێنن، تـا ئەو ئـاهۆ پیسە لەکۆڵ دەبێتەوە.

سـەبارەت بەوە کـە زەوییەکەی جوامێر لە تەنیا دۆنمێ زێتر نەبوو، دەیتوانی بەپێی ئامـۆژگــاریی پســپـۆڕە لـە کـشــتـوکـاڵ زانەکـە بـەسـووک و ســانایی زەوییــەکــەی بۆ چاندن ئامــادە کـردبا. سێ جـارانی وەرد دایـەوە، بۆ خــۆی خۆشـەی کرد و ئامادە و تەیار بوو بۆ وەرزی نوێ.

ئێستا مـانگایەکەی چکۆلەتر دەهاتە پێش چاو، لەمـەیش وا تێ گەیشت کـە تەواوێ سـەرکـەوتووە و لە داوێنی چیاکەی تێ پەڕاندووە و وەختـە سێ یەکێکی ببڕێ.

بە سستییەکەوە هـەڵستا، چوو بۆ کن هێسترەکە، لەگەڵ دەمەدەمی ئێوارەدا خـاو بـووبووەوە، لە مێـخسـکەکـەی کـردەوە، سـواری بوو، بـەرەو مـانگایەکـەی ڕانی. بەدارەکەی دەستی، کە مـاندوو دەبوو خـۆی بەسـەریدا دەدا، چوار پێنچ دارێکی پێـدا کێـشـا، گـورجێ هێنایەوە. ئەمــەی بۆ چاوترسـاندنی کرد.بـەمـە هێسترەکەیشی نیگەران کرد، چونکە مانگایەکەی ڕاو نا و بەربووە وێزەی، بێ بەزە، لێ دە کوێت دێشێ.

ئەوجا شمەکەکانی کۆکردەوە، وەکو هـەموو جارێ، کە هـەموو ڕۆژێ دەیکرد، لیـژنەیەک گزرەداری وشکی لەسـەر پشـتی مـانگایەکە دابەست و بەسـواریی هێـسـتـرەکـە وەدووی خــۆی دا و بەســەر هێـســتـرەکــەوە کـووڕ بـووبووەوە،

ماندوێتیی ئەو ڕۆژە بەجارێ بڕستی لێ بڕیبوو.

لە ڕێگە ڕووانی، جۆگەلە لاوازەکە وا خەریکە وشکاو دێنێ و ئەو جۆرە ئاوەشی کە پێدا دەڕوا ناگاتە مەزرایەکەی یۆسف بابک، ئەو پیاوەی کە بڕێ خێزانی بەملەوە بوو و ڕزق و ڕۆزییەکەی زۆر قوت بوو و هەرچەندی دەکرد، بەشی نەدەکردن.

جۆگەلەکە ئاوی لە شوێنێکەوە بۆ دەهات، لەسەر چیاکە، لە پشت ئەو گلکۆ بەئەفسانە و بە بەندوباوەکەی کابرای پیاو خراپەوە. ئەمەش واتە:

جوامێر وەڵامێکی دەردەست نەکرد دڵی پێ داکەوێ. تۆ بڵێی خێوەکەی ئەو کێوە زۆربەی ئاوەکە هەڵنەلووشێ، یاخۆ ڕک و تووڕەیییەکەی بەتۆڵەیەکی کاری وەرنەگێڕێ و ئاوەڕۆی کانیاوەکە بەرەو ڕووکارێکی دیکە وەرنەگێڕێ و بەوە داوێ بۆ وەرزێرانی ئەم ناوچەیە نەنێتەوە و تووشیان نەکا.

لە ڕێگە تووشی دراوسێیەکەشی هات، ئەوەی کە زەوی و زارەکەی لەپێش زەوی و زارەکەی ئەوەوە بوو. سڵاویان لێکتر کرد. باسی کەموکووڕیی ئاویان کرد. کابرای دراوسێی بەمەی دەزانی، بەڵام هیچ پێ نەدەچوو لە کەم ئاوی بەگازاندە بێ، چونکە زەوییەکەی ئەو لە سەرووی زەوی و زاری هەمووانەوە بوو و ئەوەندە ئاوەیش کە دە گەیشتە زەوییەکەی بەشی ئەو مەزرا تووتنەی دەکرد کە بەپێچەوانەی جوامێرەوە، بۆ خۆی زۆری بەتەنگەوە نەدەهات.

– ئەوە چەند ڕۆژێکە جۆگەکە ئاوی زۆر کەمە.

– دەزانم، زستانی ڕابردوو بەفرەکەی کەم بوو. هێندێ کانیاو نەتەقینەوە. هیشکاویان هێنا.

– یەک دوو دارم بەلاتەنگەی مانگاکەدا دا، چاوترسێنی کەم، کەچی ئەویش وا بۆ خۆی دەشەلێ، تۆ بڵێی تووشی شتێکم نەکردبێ. بێ بەزەم داپڵۆست.

– جا بۆچی داتپڵۆست جوامێر، خۆ مانگایەکە مانگایەکی بەزاوزێ و شفتەژێیە، خوانەگرتوو.

– بەڵام،

– ئەم جارە پێش ئەوەی بزێ بیبە بۆ شار، با لە بەیتاڵخانەکە بزێ. ورد و درشت، باسی زاوزێیەکانی تریشی بۆ بەیتاڵەکە بگێڕەوە.

– ڕەنگە بیکەم. خوا حافیز.

جوامێر دەبوو بەلاپاڵی کێوەکەدا بەرەو ئاوایی بوایەتەوە، هەرچی کابرای دراوسێی بوو بەدەشتە چکۆلە پڕ کەند و لەندەکەدا بەرەو ئاوایی دەبووەوە.

گوندەکەی جوامێر لە دوورەوە بەدیار کەوت، زنجەکەی خۆیان و زنجیرەیێ زنجی پەرت و بڵاوی بەو قەدپاڵە ڕەقەنەوە کە بۆ کشتوکاڵ دەستی نەدەدا، بەدی کرد. چەند دێیەکی دیکەی ئەو دەوروبەرەشی دیت. لە دوورەوە دووکەڵیان لێ هەڵدەستا. ئەو گوندە گەورەیەی سەر گردەکەشی دیت، کە فێرگەکەی لێ بوو و هەموو سبەینانێ ئامینەی کچی کتێب و دەفتەر و خۆراکەکەی: هێلکەیەک، لەتە پەنیرێکی وشک، سەرکە پیازێ، یەک دوو ئەستورکی بەبن هەنگڵەوە، بۆ ئەوێ دەچوو.

کاتێکی گەیشتە سەر گردە تاوێرەکان کە لەوێوە بەرەو ئاوایی شۆڕ دەبووەوە، تەماشای کرد ئاوایی چکۆلەیە، ئاواییەکی چەند زنجیی پەڕاگەندە و پرژ و بڵاوی بێ سەر و بەر، لە شوێنێکی وشک و برنگی بەردەلانی ئاوەسوودا و کەندێکی وشک لە پشت زنجەکانەوە بەدەوریدا پێچی دەکردەوە و باراناوی کێوەکەی بەرەو شوێکی دوور دەبرد و گوندەکەی لە لافاو دەپاراست.

جوامێر بەدەنگێکی بەرز، وەک لەگەڵ برێ خەڵکی بێ. دەستی بەقسان کرد:

– پێم گوتن وریابن. هاوینێ پێم گوتن، پایزێ پێم گوتن. کورە، ئەم سێڵاوی زستانەی، ئێستا بەر دەرکەی لێ گرتووین، لە کێشدا نییە. پێم گوتن، ئاوەڕۆی ئاوایی لە زۆر شوێنەوە پڕبووەتەوە، بێت و شەستەبارانێ ببارێ ئاوایی سەرلەبەر نوقم دەبێ. گوتم، کورە، پیاوی چابن، وەرن بەدەستاوی و گەلەکۆمەگی هێندێ شوێنی ئاوەڕۆکە، کە وەختە پڕبێتەوە، دەردەین، جۆماڵی

کـەین. گـوێیـان نەدامێ، گـوتیـان ئەم سـاڵ باران ئـەوەندە نابارێ، وەک لە ئاسـمـانەوە نامـەی تایبـەتیـان بۆ ناردرابێ. نەخـێـر بارانێکی زۆر دەبارێ و سێڵاویش بەکەیفی تۆ هەڵدەستێ، تەنانەت نەمدەزانی بەژنەکەشم و هەردوو کەنیشکەکەشمی بسەلمێنم. چاویان پێ دەکەوێتەوە، خۆیان دەبیننەوە. مانگا زەرد بەرەو گوند شـۆڕ بووبووەوە، بەکوڵ و کەسـەرێکەوە قـۆڕاندی، ئەڵهـای پشـتیـر و ئاخـوڕی شـەوێی دەکرد، غـەریبیی کاوێژی دەکـرد. خـواخـوای بوو هەرچیی لە گـواندا هـەبوو دادۆشـرێ و گـوێرەکـەیەکی پێ گـۆش کـرێ، بەتووڕەیییەوە بەسەر مانگاکەیدا قیژاند، ڕای کێشا:

– وەرە خـوارێ مـەلعـوون، لە گـوێرەکـەی مـردوو و لەبارچوو بـەولاوە چیی دیکەت دەبێ! ئەم مـانگرتنەت لە چی، بەچیـتـەوە! وەحـە وەرە خـوارێ! کـابرا مانگای تاینی وا ڕادەکێشا، ناچار ملی دا، سـەربەرەوخوار دوای هێسـترەکە کەوت.

ڕۆژیش خـەریک بوو لە بڵـیندایییـان سـەرەوخـوار دادەکشـا و دەرەتانی بۆ شـەوێکی پایزەی کزە زسـتـاناوی چۆڵ دەکـرد، کابرا گـەیشـتـە زنجـەکـەی، یا هەرسێ چاوخانە زنجە دیوار بەدیوارەکەی. جوامێر چەند ساڵێ لەمـەوبەر تا بڵـێی بەگـوڕ و توان بـوو. دڵی زۆر بەدنیـا خـۆش بوو. زۆر بەهەویا و ئاواتەوە بوو. هـەرسێ زنجەکەی بەدەستی خۆی بنیات نابوو و بەجـۆرێکی لە پاڵ یەکدا دروست کردبوون، یەکەمیـان بۆ هـەردوو کـەنیشـکەکـەی و دووەمیان بـۆ خۆی و ژنەکەی کـە ئەوساکە، هێشـتا نەخۆشیی تـەنگەنەفەسییـەکەی بەبارێ پەژارە و خـەمی ڕەزا قـورسـەوە وا سـواری کـۆڵـەی سـینگی نەبووبوو. هـەرچی زنجی سێیـەم بوو، ئەوە گەوڕی مانگاکـە و هێسترەکە بـوو. هێسترەکە ئـەو سـەردەمە لە ئێـسـتـای بەتوان و گـوڕتر بوو. تەنوورەکـەشـیـان لەو بەراییـیـەوە دروست کردبوو، سـەری وەتاک بوو. کەیوانۆکەی کولێرە و ئەسـتورکی پف هـەڵاتووی هەڵتۆقیوی خۆشی دەکرد، بەحەوتوو هیچی لێ نەدەهات.

جـــوامـــێـــر هـەناســـەیەکی بـۆ ئەو ڕۆژانـە هەڵکێـــشـــا، لە ژنـەکـــەی، بۆ چاوتروکاندنێ، دەسـتی لە کار و فرمان هەڵنەدەگرت، کەچی ئێستا شـەرمین

نانەکەی دەکرد، بەڵام ئەم لە کوێ و دایکی لە کوێ، کێ دەسکی لە دووی ئەو ژنە چاکە دەکرد.

شەرمین گورجێ بەپیریەوە چوو، هەوساری مانگاکەی لە دەست ساند، بردیە گەوڕەکەوە، کە هێشتا تیریژی تیشکی زەردەپەڕی تێ نەخزابوو، لیژنە سووتەنییەکەی داگرت.

– باوە سووتەنییەکی زۆرمان کەڵەکە کردووە، ئەمە بەشی دوو ساڵ زێتر دەکا، ئەم هەمووەمان بۆ چییە.

– شەرمین دەبینی، زستانی ئەم ساڵ زۆر سەخت و تووش دەبێ بەفرێکی زۆر دەبارێ، لافاو بەجارێ دنیا ڕادەماڵی، دوور نییە ئاواییش ڕاماڵێ، بەڵام کەس بڕوا ناکا.

تەنانەت ئێوەیش هەروەک ئەوانی تر بڕوا ناکەن، بەڵام دەبینن. ئاگات لە سووتەنییەکە بێ، لەوانەیە بەحەوتوو نەتوانین سەر لە کۆلیتەکەمان دەرێنین.

کابرا بەدوایەوە بوو، ڕێشمەی هێسترەکەی گرتبوو، بەرەو پشتیرەکەی ڕادەکێشا، گوتی:

– ئەی ئەو دوای زەخیرەکە، ئارد، ڕۆن، خوێ، پیاز، هۆڕە هەرزن و گاڵەکە، ئەوەندە کا و جۆیەی لە پارەوە بۆ ئالیکی ولاخەکان مابووەوە.

– هەمووی لە شوێن خۆیەتی، چۆن مابووەوە، هەروا ماوەتەوە. بەڵام ڕەنگە پێویستمان بەهێندێ گۆشت ببێ، وشکی کەینەوە، خۆ تۆ، ناشکوری نەبێ، نێچیرێکی وا گەورەشت ڕاو نەکرد، گۆشتەکەی وشک کەینەوە، پارەکە، لە بیرت دێ؟

– ئائا لە بیرمە. کێوییەکی فرە بەغەز و بەز بوو، دوو شاخی کەوانیی پێوە بوو، کەوڵێکی قاوەییی زبری هەبوو، بەڕاستی چاک بوو، بەتەڵەوە و هێنامانەوە، بەڵام ئەم ساڵ نێرییە کێوی، بگرە بزنەکێوییش ئەو ترۆپکی چیایە بەجێ ناهێڵی. ئەو جێی، خێوە بەسامەکە لە ترسی بەفر و بەستەڵەکی زستان خۆی لەو ژێر مەڕمەڕە شینانەیدا حەشار داوە. لەو ڕۆژانەدا

بزنەکێوی و مامز لەوێ مۆڵ دەخۆن، دەڵێی پەنایان بۆ بەر گۆڕخانە بەسامەکە بردووە لە گەڕوبەڵای ڕاووشکار و مەرگیشیان بپارێزێ. بزانم نێچیرێکی زەلام ڕاوناکەم، گۆشتەکەی بۆ وشککردنەوە بشێ. ئەرێ ئەوەندەمان خوێ هەیە بەش بکا.

– ئا ئا، بەش دەکا.

مانگاکەی بەستەوە، گوتی:

– وڵاخەکان تێروتەسەلن. با بچم یەکجاری مانگاکەش بدۆشم، ئینجا دوایی دەچم بەلای دایکمەوە، باوە، شوکور ئەمڕۆ زۆر چاکە.

– نامەخوا چەند دڵنەرم و بەبەزەی شەرمین گیان، قژ خورماییە وەک گڕی ئاگرەکەم. تۆ بیر لە هەموو شتێ دەکەیەوە.

بەرەو کۆلیتەکە چوو، هەواڵێکی ژنە دەست و دڵ چاکەکەی بپرسێ. وەختی خۆی دڵی لێ چووبوو، ڕەدووی کەوتبوو و بۆ خۆی بەکامی دڵی شووی پێ کردبوو. تەماشای کرد، لەبەر تیرێژی هەتاوەکەی درزی دەرکەوە خزابووە ژوورەوە، هەڵکورمابوو، پشتی بەدیوارەکەوە بوو.

– ئێوارەت بەخێر ئافرەت، چۆنی ئەمڕۆ؟

– چاترێکم، ئەی تۆ چۆنی؟

– هەروەک خۆمم، ماندوو و شەکەت.

پێڵاوەکانی داکەند، گوتی:

مانگا نەحلەتییەکە گووم بوو، هێندەی لە دوو خولامەوە، خۆشم و هێسترە پیریش بەهیلاک چووین. پووشی ئەم ملە و یاڵانە تامی تامیی دابوو.

– دەبوو لە جێگەیەکت بەستبایەوە، زۆرت لێ دوور نەکەوتبایەوە.

– من بۆ ئەوەی دەبەم بۆ خۆی بلەوەڕێ. هێسترەکە وەک ئەو نییە، بەقنیاتە، بەو بەشە گیا و گۆڵ و پووشەی لە چواردەوری پەت و مێخسکەکەی بەری دەکەوێ قایلە.

– کەواتا چاکتر ئەوەیە مانگاکە لێرە بەجێ بێڵی.

– ئەوەی بۆ زستانی بۆ پاشەکەوت دەکەین دەیخوا.

هەرچییەک بێ، بۆیە سەرکەوت. وەک بڵێی، شتێ کامی کامیی پێ دەکرد و دنەی دەدا، کێ ناڵێ بۆ ئەوە نەبوو بەرەو هەڵدێر و دوو بەختییەکم نەبا.

– بۆچی تا ئێستاکەیش گۆڕخانەکە هەروا بەسام و ترسە؟

– وا دیارە لە نیوەڕوان بەپاشەوە لە جاران زۆر بەسامترە. هێندێ لە مەزرا دراوسێکانمان دەڵێن، خێوەکە بەڕۆژی نیوەڕۆ دەبینین. زۆر بەپەرێشانییان باس دەکرد.

کابرایەکی چەتەوڵی درێژی سینگ و باڵ ڕووت بێنەوە پێش چاوت، برینێکی قووڵ بەلاکەلەکەیەوە بێ و خوێنی لەبەر بڕوا و بەمستەکۆڵە هەڕەشە لە وەرزێرانی نێو کێڵگەکان بکا.

چیاکەی لە وەرزێرەکان قەدەغە کرد، وا دیارە ئەم جارە دەیەوێ لە مەزراکانیشیان دەر کا. لەو ڕۆژەوەی پەیدا بووە بەروبووی دار هەمووی بەسەر یەکدا کەڵەکەبووە و بۆگەنی کردووە. هەروا کۆمەڵە گوێز و هەرمێ و گوێژ و دار و دەستەکی سەربان دارەڕاکردن بۆ خۆیان لەو ناوە بێ ناز کەوتوون و ڕزیون.

– جا بۆچی، بیرێکی لێ بکەنەوە، چارەسەرێکی بکەن.

جوامێر هەستا، وربەکەی بەمێخێکەوە، بەدیوارەکەی ئەوبەرەرە هەڵاواسی.

– دنیا ساردە.

– دەسا من گەرمامە، وا لە ژێرەوە ئارەقە دەردەدەم. ڕەنگە نەخۆش بم. ئەرێ چت گوت چت گوت؟

– گوتم، شەوەنگەکە، خێوەکە دوورخەنەوە، چارێکی کەن.

– چۆن؟ ئەوە خێوە، خۆ هەروا گاڵتە نییە.

– کەواتا دەبێ پیاوانە و کەڵەمێردانە لە گژی ڕاچن. نەکەن مەزراکانی بۆ

بەجێ بێڵن. ژیان لە پارووی دەمەوە دەست پێ دەکا. ئێمەش بەو چەند دۆنمە زەوییە کەم و بێ بڕشتە بەڕێوە دەچین، کە هەموو شتێکە بۆ ئێمە، هەموو شتێ.

دنیا زوو تاریک داهات. هەور و هەڵا بەری ئاسمانی گرتبوو.

– ئای کە چەندمان پێویست بەبارانە.

– ئەم ساڵ پەڵەکەی دواخست. باشە کە لە وادەی خۆی دەترازێ، دەبێ، چاوەڕێی چ بکا؟

– بەڵام هەورەکەی توندە، بۆنی تەڕایی دەکەم، ئەی تۆ؟

– منیش دەیکەم، پێشم ناخۆشە.

وا پێ دەچێ بباریێ. خۆزی هەر ئێستا دای کردبا، بباریبا، خاک و خۆڵ، ئەو تۆوە جوانەی تەیروتووی بێ فەڕ دەیچیننەوە، داپۆشن.

– بۆ نایچیننەوە، کە ئێوە نەیانترسێنن. دەشیانچیننەوە و بەزیادیشەوە تەیروتوو ئاشقەجێی هێمن و بێدەنگن.

– بەکێڵگە و مەزراکانی ئێمە دەژین و لەو کێوە هێلانە دەکەن. ئای لە بەدفەڕیی تەیروتووی وا، بێ کەڵک، کەم گۆشت، هەموو لەشیان پەڕە. پۆلێکی خشتیان چارەکی ئەو ئەرکە ناهێنێ بۆ ڕاوکردنیان بەخەرج دەدرێ.

هەڵستا، چراکەی پێ کرد، فوویەکی لە گڕی دەنکە شقارتەکە کرد، کوژاندییەوە، بەسڵۆکی و وریاییی وەرزێرێکەوە لە کوژانەوەی دەنکە شقارتەکە دڵنیا بوو و بەرەو دەرکەی تووڕ هەڵدا. دەرکە دوور نەبوو، زنجەکە چکۆلە بوو. نزم بوو. وا نەبوایە زستانان، بەو شەوگارە سارد و سەرما دوور و درێژە چی گەرمی دادەهێنا. تەماشای کرد ئاگرێ لە حەوشە کراوەتەوە. حەوشەکە بەدیوارێکی بەرد و قوڕ شوورە درابوو. تەماشای کرد، با ئاگرەکە بەڕاست و چەپدا دەهێنێ و دەبا. شەرمین شێوی لێ نابوو، زۆری پێ نەچوو، بەتەوەقێکەوە چووە ژوورێ، شێوی بەسەرەوە بوو، تەوەقەکەی بەکاوەخۆ، لەو سەر زەوییە ڕووتە دانا.

بەدەنگێکی نزم و پڕ بەبەزەیییەوە بانگی کرد:

– ئامـینە، وەرە شـێـو بکەین، ئەم شـەو زۆر سـاردە، دەبێ چاک بخـۆی، جارێ لە کتێب خوێندنەوە گەڕێ. وەرە بەلای شێوەکەتەوە.

باوکـە دوای دەسـتنوێژ شـوشتن و نـوێژی ئێـوارە دانیـشـتبـوو چاوەڕێی ئامینەی کچی دەکرد.

– کـچەکـە تا دێ بـارێک و بنێـسـتـر دەبێ. ڕەنـگ و ڕووی هیچ پێ نەمـاوە. زۆرم پێ ناخۆشە. نازانی وای لێ بەسەر هاتووە شەرمین.

– بەڵێ، چونکە کەم دەخوا و ڕێگەکەشی دوورە، بەزەحمـەت دەگاتە فێرگە. ئامـینە، کـە هات هەردوو چاوی بووبوون بـەکاسـەی خـوێن. دەتگوت یەک دوو سەعاتێ بەکوڵ گریابوو و هەر ئێستا چاوی سڕی بووەوە.

جـوامـێـر سـەیرێکی سـفـرەوخـوانەکـەی کـرد. بـەوردی چاوێکی بەنان و پێخۆرەکەی سەر تەوەقەکەدا گێڕا. شەرمین گوتی:

– هەر ئەوەندە پەرژام، شـۆربای برنجەکە بۆ دایکم زۆرە، بەشی هەمـوومان دەکا. ڕەنگە هـێلکەکان بەشی هـەمـوومـان نەکەن. مـریشکەکان مـاوەیەکە لە هێلکە چوونەتەوە. دۆشاوی مێوژەکەیش ئەوەیە کە پلکم لە جێژنی ڕابردووەوە بۆی بـەدیاری ناردووین. ئـەوجــارە کـە باوکم کـیـسـە هەرزنەکـە و چوار مـریشکـەکـەی بـۆ نارد، پێـی لێ لەکـۆشێ کـردین: ئێلکەم وبیلکەم دەبێ ئەو دەفرە زلە پڕ کەین لە دۆشاوی مێوژ و بیبەین. لە بیرت دێ باوە؟

جوامێر گوتی:

– لەو دۆشـاوە زۆر بخـۆ ئامـینە، بۆ تۆ زۆر چاکە. دۆشـاوی مـێـوژ بۆ هێـز و گوڕی بینایی چاکە. زۆر دەخوێنییەوە تۆش. ئەوەی تێ بکۆشێ بەئامانج دەگا، دەستی ماندوو لەسەر زگی تێرە.

شەرمین گوتی:

– کـە ئاوەکـە بەکوڵ هـات چایەکـەش لێ دەنێم. حـەوت جـۆشـەکـەم لە ڕەخ ئاگردانەکە داناوە. سـووتەنـیی زۆری ئەمـساڵەکـە وا لە پیاو دەکـا، ئەم شـەو

نەبێ کە زۆر سەرمایە، ئەوەندە گوێ بەزیادە سووتێنی نەدا. دایە، هەر ئێستا سێڵێ پڕ ئاگرت بۆ دێنم.

دایکە بەهەراسانییەوە بەدەنگ هات:

– نا نا، نامەوێ کچم، ئەگەر خۆشت دەوێم ئیتر ئەوەندە ئاگر مەهێنە ژووری، زۆرم ئازار دەدا.

– دایە ئەوەی ئازارت دەدا دووکەڵەکەیە، من ئاگری کڵ و کۆت بۆ دێنم.

جوامێر گوتی:

– دە شۆربایەکەت بخۆ، شۆربایەکەت بخۆ، با سارد نەبێتەوە، بەڕاستی خۆش و بەتامە، جارێکی تر کەوچکە دارەکەی بۆ دەمی برد، کە دەستیان بەنان خواردن کرد، کڕ و کپییەک دای گرتن.

بەرەو مەزرا دەچوو، لە پێچەکەدا تووشی حەمید خۆشناوی دراوسێی هات. هەندێکیان ڕاز و گلەیی لێک کرد:

– ئەم ساڵ ساڵەکەی پشووکورت بوو، ئەوەندەی بەبەرەوە نەبوو بەشی کێڵان بکا.

– باوە، تۆ زەوییەکەت دوو گاسنە شۆ دەدەیەوە، ئەمەش کارێکی ئاسان نییە.

– کاکی برا، نامەوێ تۆوەکەم بەفیڕۆ بچێ. شۆو وەردانەوەی چاک گاسنی ڕژدی دەوێ، هێڵی قووڵی دەوێ، بەڵام تۆ بۆ خۆشت لە کەڵەکبازیی ئەو تەیر و تووە لەحنەتییانە بەئاگای، چاویان هێند تیژە دەنکە مرۆر بەمرۆریی خۆی نابوێرن.

– دوێنێ پاش نیوە شەوێ نەختێ باران باری.

– دەبوا قایمتر باریبا. ئێستا وا دەبینی ئاسمان چ ساماڵێکە. پەڵە هەور مانا بەئاسمانەوە نەماوە، ئەو هەموو هەورەی دوێنێ شەوێ چی لێ هات؟

جوامێر بەپشتی نیوە ئاوڕێکی پاشەوەی دا و بۆ ئەوەی مانگا تەوەزەلەکە لە دوای بارگیرەکەی ژێرییەوە، کە هاوشانی هێسترەکەی خۆشناوی

دراوسێی دەڕۆیشت، بەلەز و خێراتر پێ هەڵگرێ بەوەحە وەحە کەوتە دنەدان و هانەهانەی.

– هێندەی زۆری لێ مەکە، ئاوسە.

– مانگی خۆیەتی.

– دیارە.

جوامێر هەور و هەڵای خەم و پەژارە ڕەنگ و ڕووی تاڵ و ترش کرد:

– لە گوێرەکەیەکی مردارەوەبووی وەک هاوڕێیەکانی بەولاوە چیی دیکە دێنێ.

– ئەمە زۆر ناخۆشە جوامێر. ئەم مانگایە ئەم چەند ساڵە هەر گوێرەکەی مردارەوەبووی یەک لە دوو یەک دێنێ.

– باشە ئەمە چارەسەرێکی نییە؟

– پێیان گوتم، بۆ بەیتاڵخانەی بەرم، بۆ شار، مەسەلەکە لە پزیشکی بەیتاڵ ڕاگەیێنم، داوای ئەوەی لێ بکەم لە بەیتاڵخانە بزێ.

– جا، ڕێگەیەکی چاکیان بۆ کێشاوی. ئەمە ئامۆژگارییەکی چاکە. بەجێی بێنە.

– ئەو خوا دەکا بارانەکە دەبارێ، تۆوەکە دەشارێتەوە. لە ڕەگ داکوتانی دڵنیابم، سێ و دووی لێ ناکەم، یەک ڕاست دەیبەم. بۆ بەیتاڵخانەی دەبەم. ئەرێ لای ئێوە چۆنە؟

– هەروەک خۆیەتی. کوڕگەل پارەی چاک بۆ کەس و کاریان دەنێرنەوە.

– ئیش و کار لە شارە گەورەکان زۆرە.

– تەنانەت خۆشم. خۆ تۆش دەزانی، من کوڕم نییە لە شاران کار بکا. من خۆشم ویستم بچم لەوێ کار بکەم.

– ئەم زەوییە لەم ڕزقە کەمە بەولاوە چیی تر دەدا.

– منداڵەکان گەورە دەبن.

– هێشــتــا زۆر وردن. ژنەکـەی پێـشـووم منداڵی نەبوو. دە ســاڵی خـشت چاوەڕوان بوو، هیچ. تـاوەکو کەنیشکەکـەی وەهاب قومـاندارم هێنـا. ئەمیـان ژنێکی بەبەر و شفتەژێ بوو. ئێستا سێ منداڵی چکۆلەم لێ هەن.

جوامێـر لەسـەر بڵـێنداییـیەکانی کێڵـگە درێژە بەرتەسکە ڕەنگ قـاوەییـیە تیژەکەیەوە سـەیرێکی کەژەکەی کرد. زەوییە کوێستانییەکە سەبارەت بەوە کە هەموو ساڵێ دەچێندرا و پشووی نەدەدرایێ، تەواو لە بڕشت کەوتبوو، گوتی:

– ئەی دەنگ و باسی ئەوەی ئەوێ چییە؟

خـۆشناویش سـەیرێکی ترۆپکی کـەژەکەی کرد، ڕوانی بـەو ڕووناکیی ڕۆژە بەرزە لەگەڵ کێڵگەکاندا سەرەتاتکێیەتی. گوتی:

– دەڵێن پاش نیوەڕوان بەدیار دەکەوێ.

– تۆ دیتت؟

– من نەمـدیت، بەڵام بەو کـەسـەی خـەبەری دامێ بڕوا دەکەم، ئەو دیویەتی جا چ بوو، وا پاش نیوەڕوانانیش بەدیارکەوت، زیانی چییە؟ ئەو خۆی بۆ شەو دەنێتەوە. ئای لەو پاسەوانە بەسامە. پاس لە هەموو شتێ دەکا لەوێ.

جوامێر گوتی:

– گـاسنەکـە ســواوە، زەوی ڕەقـەن ئاسنی ئاسـاییش دەخـوا. پێـویســتم بەگاسنێکی تازەکوورەی تیژتر هەیە.

– ئەی خۆ تۆ دوو جارت زەوییەکە وەرددایەوە.

– دەمـەوێ جاری سێیەمیش زەویی تووتنەکە وەرددەمـەوە. دەڵێم بەشکو لە ژەنگ و نەخۆشیی پارەکەی پاکژ کەمەوە.

– تۆ زۆر ناچێنی.

– نیو دۆنمێکی چاک لە پێنچ دۆنمی بێ سەروبەر چاترە.

– ئەی دەرد و سەرێشەی ئاو؟

– ئاوەڕۆکــە زۆر پڕبـووەتەوە، تەنکاوێکی پێــدا دێ و چیی تر، بـەڵام کــە لاسکە تووتن دەست بەفـرازیبــوون دەکـا و هەڵدەدا، ئەویش پڕ دەبێ. ئەمــە

خووی کانیاوەکانە. ئاخر و ئۆخری هاوین دەدەنە کزی، کە زستان داهات بەبەفر و باران زیاد دەکەن و بۆ ساڵی دوایی دەتەقنەوە.

خۆشناو گوتی:

– بەخوات دەسپێرم. کارم هەیە، دەڕۆم، دەمەوێ هێندێکی دی تووتن بچێنم، دەڵێی چی؟

–چەندت زەوی بۆ تەرخان کردووە؟

–دۆنم و نیوێ.

– نیو دۆنمی دیکەی باوێیتە سەر خراپ نییە، لەوانەیە نرخی داهاتی ئەمساڵ چاتر بێ.

جوامێر لە هێسترەکە هاتە خوار، پیرە هێستر هێز و گوڕی پاش حەسانەوەی دوێ شەوێی هێشتا تێدا مابوو، بردی، لە بناری نشێوە چکۆلەکەی بەستەوە. پووشەکەی بەشی ڕۆژێکی دەکرد. هەرچی مانگاکەیش بوو هەوسارەکەی گرت، قەیرێکی تێ ڕاما.

– ئەمە چاترە، باش بوو ئەم پەتەم دیتەوە و هەوسارەکەم بۆ درێژتر کرد، تا ئێوارە هەر ئەوەندە لەوەڕەی بۆ دەخورێ. نامەوێ بکەومە هەڵەکەی دوێنێوە.

کاتێکی لە بەراییی کێڵگەکەوە، لەسەر قەمە تاوێرێ دانیشت، ڕاهاتنە، جگەرەیەکی پێ کرد، کێڵگە تووتنی وەرزی تازەی بەبیرهاتەوە.

– دۆنمێ بکێڵم زۆرە، ئەو بەشە زەوییەی بۆ تووتنم گلداوەتەوە بەکەڵک نایە، زەوی لێرە، هەمووی درشت و کێوییانە هەڵکەوتوون، چونکە خاکەکەی سەرلەبەر لەو کێوە تاریکە ڕەنگ و ڕوو گرژەوە داشۆریوەتە خوارێ. با هەر بەنیوە دۆنمێکەوە تێوە گلێم، چ دەکەی ئەوەی کەڵکی تووتن لێچاندنی پێوە هەبێ هەر ئەوە ماوەتەوە.

جوامێر سەری بەلووتی بەرزییەکەوە بەرەو کەژەکە هەڵبڕی، بڵندایی گۆڕخانە بەسامەکەی بەر دەرکی ئەشکەوتەکەی دیت.

– ناشێ ئەمە گۆڕخانە بێ، تا ئێستا کەس دووپێی نەهاوێشتووەتە سەر

ئەو دوندە. کەس بستێکی لێ داگیر نەکردووە، بەڵام ترس، ئەمنیش وەک خەڵکی تر دەترسم. دەنا بێ سێ و دوو لێی بەسەردەکەوتم. بەر لە چەند ساڵێ ئەو دوندە بۆ هەمووو کەسێ چوونیەک بوو، بەڵام ئێستا خێوەکە بووە بەپاسەوانی ئەوێ و بۆ خۆی داگیری کردووە. چ دەڵێی خێوە، باشە خێو ئەم هەموو دوندە پان و بەرینەی بۆ چییە؟ چ پێداویستییەکی پێیە؟ کەواتا ئەم خەڵکە بەخەیاڵ ئەم خێوەیان دروست کردووە.

هەروەک خووی پێوە گرتبوو، چاڵێکی لەبەر پێدا هەڵکەند، ویستی بەدڵی خۆی قووڵی بکا. ئەوجا جگەرەکەی کوژاندەوە و قونکەکەی تێ هاویشت و بەخۆڵ پڕی کردەوە. لە پاشان کە ڕاست بووەوە، لە سێبەندە و کڵۆترا هەستی بەبریسکەی ئازارێ کرد، گوتی: «مادامێکی هەر نیوە دۆنمێ بچێنم بۆچی زەوییەکە سەرلەنوێ دێراو نەدەمەوە. خۆ دەتوانم بۆ ئەوەندە زەوییە بەرتەسکە شوورە بەردێ لە پاین لێژاییەکەوە هەڵچنم و بەری بەباران داشۆرانی خاکە بەکەڵکەکەی پێ بگرم. چاکە کارەکە هێند زەحمەت نییە. دەمپەرژێ بیکەم». دەستی بەبەرد و خڕک کۆکردنەوە کرد و بەکاوەخۆ بەوشکە کەڵەک شوورەیەکی نزمی هەڵچنی. نەیدەویست خاکە زەوییەکەی بۆ تووتن چاندنی تەرخان کردبوو، بەدەم سێڵاو و بارانەوە داخورێتە خوارێ، لە پڕێکدا هەستی بەتۆقینێ کرد، وەک بڵێی یەکێ شەپڵەیەکی وەک شەقازیلەی لە پشتی ملی سرەواند، ئاوڕی دایەوە چیی نەدیت. بەڵام دامرکانەوەی ڕۆژ وای لێ کرد، لەناکاو چەند دڵۆپە بارانێکی درشت درشت ببینێ و قرپوە و هەلهەلە لێدانێکی بەر گوێ کەوت، هەرایان بۆ باران بارین دەکێشا و شمەکیان خڕدەکردەوە، بەرەو ئاوایی بگەڕێنەوە.

جوامێر چوو، هەوساری مانگا بارگرانەکەی کردەوە و سواری هێسترەکە بوو. هێسترەکە ئەو ڕۆژە لە هاتنە سەرمەزرا و لەوەڕانی بەیانیان بەولاوە چی دیی نەکردبوو.

لە گەڕانەوەدا بارانەکە بەتاوتر دەباری، بارانێکی کڵاوبەسەرەی شەستە و ڕەهێڵە بوو، کە بەردەم و چاوی پیاو دەکەوت هەر دەتگوت شەپڵە و

شەقازیلەی ساردە، ئا ا ا ا ا. کەوابوو ئەوەی بەپشتی ملیدا کێشام باران بوو. باران، شتێکی تر نەبوو.

دنەی هێسترەکەی دا خێراتر بڕوا، بێ سوود بوو، هێسترەکە زۆر بەتەنگ ڕۆحی خۆیەوە بوو. دەیزانی بەهەر هەڵخلیسکانێ لەوانە بوو دەستێکی یا پاشووێکی بشکێ و ژیانی ببڕێتەوە و دوایی بێ. بەڵام مانگاکە لەبەر قورس و گرانی و سم بڵاوی لە هەڵخلیسکان بەدوور بوو.

کاتێکی گەیشتە بەرایی لێژاییی تاوێرەکەی بەرەو ئاوایی و زنجەکان، ئاوڕێکی پاشەوەی دا، تەماشای کرد هاوڕێیەکانیشی وا خەریکن دەگەڕێنەوە و سەر و پۆتەڵاکیان تەڕ بووە.

بەتووڕەیییەکەوە هاواری کرد:

– کورە هۆ گەمژە و گەلۆرانی گوند وریا بن. خۆ لەم بارانە بپارێزن، خۆ تەنیا شەوێ، بێ پشوو بباریێ، لێمشت و سێڵاوی لووتکە و دوندی کۆ و کۆساران بەجارێ ڕاتان دەماڵێ.

پێم گوتن، ئەگەر ئاوەڕۆکە پانتر نەکەوە، جۆماڵێکی چاکی نەکەن دەبن بەژێر لافاو و لەهییەوە و نوقم دەبن، کەس گوێی نەدامێ، ئەمشەوەکە، یا سارەشەو هەربینا لافاو ڕای ماڵین. بەڵام کە زانیی باران، تنۆکی چییە، لەسەر کەژەکە نەباریبوو و بۆ ئەوەی تۆوی بە شۆمەوە وەرکراو بشارێتەوە و بۆ خولی تازەی ژیان گیانیان بەبەردا بکا، گاڵتەیەک بوو لەگەڵ گوند و زەوی و زاری بێ پێز و کەم برشتدا کردی.

ئامینە:

– تۆ زۆر تەڕ بوویت باوە. وەرە ژوورەوە، لای ئاگرەکەوە. جلە وشکەکانت لەبەر کە، خۆت پۆشتەوەکە، دانیشە، چایەکی زۆر بەتامم بۆ دەم کردووی. ئامینە گوتی:

– دەڵێی کارێکی تازەت کردووە، باوە زۆر ماندووی؟

– هیچم نەکردووە، ئەو سەر مەزرایە پێویستی بەهیچ کارێ نییە، هەروا

ڕاهاتووین. هەروا لە خۆڕایی بۆ ئەوێ دەچین. لە بێ کاری و خۆلستنەوە چاترە. داوی بێ کاری چی لێ شین نابێ.

کڵاشەکانی لەبەر دەرکە لە پێ داکەند و ڕێشمەی هێسترەکەی دا بەدەست شەرمینی کیژییەوە و داخلیسکایە ناو زنجەکەوە. هەرچی مانگاکەیش بوو هەوسارە درێژە ڕێخاوییەکەی پەلکێش کرد و بەتەنیا بەرەو گەوڕەکە دای کێشا. جوامێر دایە بۆڵە و لەحنەت باراندن.

– ئاوایی وا لافاو ڕای دەماڵێ، بەژێر سێڵاوەوە دەبێ.

ئەم سوێڵە سوێڵی مـن نەوێ ئەگەرەکە وەهانای کەسەوە بچم. ئاوەڕۆکە بەرگەی سێڵاوی ئەم هەموو بارانەی ئەمشەوەکە ناگرێ.

بەڵام کە بارانەکە لێی کردەوە و هەور و هەڵا بەدەم بای تیژ و تووڕەوە هەڵی پریواند و ڕەوییەوە، ناهومێد بوو. لە پاشان زۆری نەخایاند مانگ هەڵات و گەواڵە هەورێ بەدەم باوە هەڵدەهات و ناو بەناو بەری لێ دەگرت.

– مادامێکی باران لێی کردەوە باوە،

– ئەوە دەڵێی مەترسی لە سێڵاو ناکرێ؟

– جا بۆ دەبێ سێڵاوی ئەمساڵ توند و تیژتر بێ؟

– نازانم، بەڵام من لەوە دڵنیام کاتێکی خەبەرم دانێ هەستیان بەمەترسی و دووبەختی کردبا، کاتێکی پێم گوتن ئاوەڕۆکە دەردەن و جۆماڵی کەن، با بەشی هەموو لافاوەکە بکا، ڕەنگە لە بۆرانێکی کە دێ، ڕزگاریان بوایە.

ئامینە بۆ ئەوەی ئازاری دڵی باوکی نەدا لە ژێرەوە دایە پڕمەی پێکەنین، شەرمین تێ گەیشت بەچی پێکەنی.

هەردووکیان تەوسیان بەپێشبینیی باوکە پیرەکەیان هات کە پێشبینیی خەون و خەیاڵێکی دەکرد لە ڕووداو بەدەر بوو و بەدەم ترس و سامەوە دەکەوتە وڕێنەکردن.

هەرچی جوامێر بوو پاش ئەوەی کە جلە وشکەکانی لەبەر کرد و دووەم پیاڵەی چای خواردەوە هەستی بەگەرمبوونەوە کرد.

٢

لە ژێر ئاسمانێکی گرژ و مۆندا، ناوبەناو بەلاسامە و لێزمەوە، ژانی هاتێ. شەرمین ڕاپەڕی باوکی وەخەبەر هێنا. جوامێریش، وەک خەڵکەکە، ئەویش وازی لە چوونە مەزرا هێنابوو، مەزرا هیچی وای تێدا نەمابوو پێویستی بەکار بێ. دایکە لە پێش ئەودا بەخەبەر هات، گوتی:

– جوامێر، هەستە. شەرمین دەڵێ، ژانی هاتووەتێ. جوامێر چاوی هەڵێنا، تەواشای کرد، شەرمین بەبەژنە باریکەکەی و قژە سوور کاڵەکەیەوە، کە لەبەر ڕووناکیی چراکەی، خۆی هەڵی کردبوو و دەبریقایەوە، ڕاوەستابوو و هەراسانییەکی بێ سەر و شوێن لە ناو چاویدا پەپکەی خواردبوو، دژمن وەجەستەی نەوێ.

– تۆ بڵێی ڕاست بێ؟

– قۆڕەقۆڕی بەخەبەری هێناین، ئەوە چۆن لەپێش ئێمەوە بەخەبەر نەهاتی؟ جاران خەوت ئەوەندە سووک بوو، لەگەڵ ترپەی پێدا بەخەبەر دەهاتی.

– کەواتا برۆ ئاوی گەرمم فریاخە، لەوانەیە پێویستمان بێ. باشە بۆ وەسەر هینەکەی،

ژنە لەش بەبارەکە هەڵی دایە:

– ئەرێ دە بەسە بەدبینی حا،ماڵتان نەشێوێ، لەوانەیە گوێرەکەکەی ئەم جارەمان خوا بۆی نووسیبێ، بمێنێ و نەمرێ، لای خوا چییە؟

– ئەی ئەگەر مرد؟

کەس وەڵامی نەدایەوە، خۆی وەڵامی خۆی دایەوە، گوتی:

– ئەو ساکە یەکڕاست بۆ لای قەساو.

– بەڵام لە بیرت نەچێ مانگاکەمان زۆر بەشیرە، ئەمە بەدنمەکی و

سپڵەیییە، هەر تەنیا بیرکردنەوەی ڕووت لەمە ئەوە دەگەیێنێ کە هیچ شتێ بەلای تۆوە نرخی نییە.

جوامێر تیلاییی چاوێکی بەسەرزەنشتەوە لە شەرمین گرت، ئیتر وەک هەموو جارێ کە تووڕە دەبوو، سەرکۆنەکردن و جنێو بارانکردنی بەدووردا نەهات. دووبارە گوتی:

– دەبڕۆ دەی، ئاوە گەرمەکە ئامادە کە. چرایەکە باش دەسووتێ لە پشتیرەکە؟

ئامینە بەترس و لەرزەوە چووە ناو زنجەکەوە.

– شەرمین خێراکە، ڕای پەڕێنە، زووکە.

– ئەوە لە چی زراوت تۆقیوە؟ دە بڵێ. لە چی تۆقیوی ئامینە؟

– هێسترەکە، هێسترەکە لە ترسان ئارامی لێ هەڵگیراوە. هەروا بەدەوری خۆیدا دەخولێتەوە و وڕێنە دەکا، دەڵێی ژانی مانگاکە تەنیوێتییەوە ئەویش.

باوکە گوتی:

– چاکە، وا ئەم هێسترە ترسنۆکە ڕادەگوێزمە دەرێ.

با جێگەکە بۆ مانگایەکە ڕەحەت بێ. هەی لەو هێسترە گەوجە لە چی تۆقیوە؟ قابیلە ئەو گوێرەکەی مردووی ببێ. ژنە نەخۆشەکە هاواری کرد:

– تۆ ئەو هەقەی لەسەرتە ئەگەر ئەم بەدبینییەی لە کەللەی داوی، لێمانی دوور نەخەیەوە.

جوامێر کلاشەکانی بێ گۆرییە لەپێ کرد. لە بیری چووبوو. نەیدەزانی گۆرییەکانی ئێوارە، لە کوێ دانابوو.

بەسستییەکەوە، چووە دەرێ، ڕووی لە ئاسمان کرد، گوتی:

– ئەمشەو بەری ئاسمان زۆر تاڵ و تاریکە.

– دوو سەعاتی ڕێک باران باری.

– دوو سەعات؟

– بگره پتریش.

جوامێر سەیرێکی لای چەپەوەی کرد، بزانێ کێوەکە چیی لێیە، لە تۆپەڵە ڕەشاییەک کە لە شەوێکی ئەنگوست لە چاودا دەبینرێ چیی تری نەدیت، لە پاشان ڕووی کردە گەورەکە و هێستەرە زراوتۆقیوەکەی ڕاکێشا، دیاربوو نەختێ هێمن بووبووەوە ڕای کێشا، بردیە دەرێ و جلە شڕەکەی بەسەر پشتیدا دا و لە حەوشە بەرەڵای کرد: «خۆی کوێی پێ خۆش بوو با لەوێ بحەوێتەوە».

– هیچ نیشانەی ژان گرتنی پێوە دیار نییە.

– ئەی بۆچی وا بەئازارەوە دەتلێتەوە.

جوامێر وەرسووڕایەوە، سەیرێکی بن کلکی کرد تەڕبوو، گوتی:

– ئەرێ، زۆر نابا، هەر تۆزێکی تر دەیبێ. شەرمین بەتاسە و سامەوە قریواندی:

– گۆلک؟ ئەوە سەریەتی باوە.

جوامێر دانەوییەوە، لە گوێرەکە ڕەشبەڵەکەکە نەوی ڕای کێشا، توورەکە گەرم و گوڕەکەی سڕییەوە، گوتی:

– بترەژم، جا بزانە چۆن کەڵێکی لێ دەردەچێ، گەورە بێ بۆ جووت لەبار دەبێ. مانگاکە بەکەساسییەوە ئاوڕێکی پاشەوەی دایەوە و قۆڕاندی، دەتگوت شین دەکا. گوێرەکەکە دوو جار جوولایەوە، بەسەر پێوە بوەستێ نەیتوانی، سێیەم جار بەپێوە ڕاوەستا و یەک دوو جار چوار پەلی لەرزی. کەوت. ئیتر بەسەر پێ نەکەوتەوە.

شەرمین دایە شین و گرین:

– گوێرەکەکە باوە؟ مردار بووەوە. ژنە نەخۆشەکە دەنگی بەحاڵ هات:

– گوێرەکەکە باوە؟ مردار بووەوە. ژنە نەخۆشەکە بەتەکییەوە بێ، لێی گەڕێن، با نەختێ بیبابێنێ و هەست بەدایک و فرزەندی بکا دڵڕەقینە.

– هەر ئەوەندەمان بەخت لێیە ئافرەت، کێ دڵڕەقیی لەگەڵ مانگادا کردووە؟

شەرمین کچم، ئاگایەکت لە دایکت بێ. با گەورەکەیش تا سبەینێ گەرم و گوڕ دابێ.

– ئاگرەکە بێ سووتەنی ناکەم.

جوامێر چووە دەرێ، دەستی شوشت، سەیرێکی ئاسمانی کرد و هەروا لەبەر خۆیەوە دایە بۆڵە و خوتە:

– بای وەشت ئەم هەورانە بۆ کوێ ڕادەماڵێ؟ بۆچی زەوی و زار تێراو بوو وا بار و بنەیان پێ دەپێچێتەوە؟

ئامینە لە نزیک جێی ژنە نەخۆشەکەوە ڕاکشابوو، هاواری کرد:

– ئەی چۆن باوە؟ ئەدی بەدرێژاییی دوو حەوتوو نەباری هیچیش بەهیچ نەبوو.

جوامێر هەستی بەجۆرە هەست بەخۆداشکانەوەیەکی سارد و سڕی کرد، چونکە نە لافاو هەستا و نە هیچ.

– دەزانم دەتەوێ چیم بەبیر بێنییەوە. دەزانم نە باران لە چیا باری و نە سێڵاویش هەستا. بەڕاستی زۆر سەیرە باران لە بڵیندایییان نەبارێ، ڕەنگە لەبەر ئەوە بووبێ کە ئەمساڵ هەورەکە زۆر بەرز بوو.

– بێ بارانیی سەر بڵیندایییان نوخشانەی لێ ناکرێ. سەر کێوەکانیش شتی وایان لێیە پێویستی بەئاو هەبێ، دار و درەخت، کانی و کانیاو، باوە.

– ئامینە، تۆ کیژی چاکی، ڕاستە تۆ لە فێرگە شتی تازە فێر دەبی، بەڵام من زۆری لێ دەزانم. باوکم هەموو لێزانییەکی لەبارەی بارانەوە فێر کردووم. من کە بەخەڵکی ئاواییم دەگوت پێویستە ئاگاداری ئاوەڕۆی لافاو بین، بەڕاستم بوو. دەبوو ئاوەڕۆکە جۆماڵی کرێ، خاوێن کرێتەوە.

ژنە ناساخەکە هەڵی دایە، گوتی:

– زۆربەی دۆستەکانت بەقسەی وشک و ڕەق لەخۆ زیز و زویر کرد، ئاوەڕۆکە شێلە و لافاوەکە بێلە، بێ بەڵا بی، جوامێر تۆ لە زۆر شت نازانی، تۆ لەمەڕ لافاو نازانی، چی تێ ناگەی. کاتێکی دێ بۆ خۆی دەزانێ چۆن ڕێگەی

خۆی دەبڕێ و دەڕوا، بۆ خۆی دەزانێ چۆن ئاوەڕۆکە دادڕێ.

– ئا ئەمەیە گێلی و گەمژەیی، خۆ کەس نایەوێ لەوە بگا لافاو کوێرە و ڕوو لە لێژایی دەکا. خەڵکەکە نازانن ئەو بەرایییەی لە کەژەکەوە بەسەر گونددا دەڕوانێ خۆڵە و لافاو ڕوو لە کەند و لەند دەکا.

شەرمین بەهەڵچوونەوە، گوتی:

– چارەنووس چۆنە بام وابێ. ئێمەمانان لەوە بێ دەسەڵاتترین، شتێکی لە وزە و کێشماندا نەبێ بیگۆڕین، نەخوازا شتەکەیش لە ئاسمانەوە چارەنووس بێ.

– ئامەنتوبیللا. بەڵان،

پیرەمێردەکە بێدەنگییەکەی هەڵاوارد:

– گوێرەکەکە ڕەنگی چۆن بوو شەرمین؟

– ڕەشێکی پەڵە پەڵە، سپیی ڕەشباو بوو، پتر بەلای ڕەشیدا دەڕوانی.

– هێندەی گوێرەکەی خواسایی گەورە دەبوو؟

– ناوەڵڵا ئەمجارە زۆر ڕیوەڵە و لاواز بوو. بەڵام پێش ئەوەی چاو لێک نێ چەند جوان و ژیکەلە بوو، جا دەبێ سبەی بینێژین؟ خۆ گوێرەکەیەکی بەکا ئاخنراومان هەیە، گوێرەکەکەی پارە! با بیبایێنێ.

– گوێرەکەیەکی ژیکەلە بوو. بۆ دەبوا پێش لەدایکبوون بمرێ، باوە؟

جوامێر تەماشایەکی ئامینەی کەنیشکی کرد، گوتی:

– دەبێ خەریکی دەرز و دەوری خۆت بی. دەبێ و دەبێ هەزار جار دەبێ ببی بەفێرکار. لە دڵڕەقیی زەوی بڕستم لێ بڕا و وا پیری قەڵەمی ئەژنۆم دەشکێنێ، یەکێ لەم خێزانە بۆ دوارۆژ ئامادە نەکرێ کەفتەکاری سواری ملمان دەبێ.

ژنە نەخۆشەکە سەرێکی ڕاوەشاند، گوتی: «خوا لە بەندە و ئەفراندەی خۆی ڕوو وەرناگێڕێ. کابرا نەیویست دڵی ژنە بەقسەیێ، بەئیشارەتێ بڕەنجێنێ.

لەوانە بوو ژن لەبەر پەژارەی نەخۆشی بەبارێکی خراپیدای لێک دابایەوە، دڵی بێشێ.

بۆ سبەینێ شەرمین لێی دا چوو لە زەوییەکی نەرماندا چاڵێکی بۆ گوێرەکەکە هەڵکەند، پڕ بەخۆی و ناشتی و بەخەمبارییەوە گەڕایەوە، هەر دەتگوت جگەرگۆشەیەکی مردووە.

کاتێکی شەرمین گەڕایەوە تەماشای کرد، باوکی لەگەڵ مانگاکەدا خەریکە. بەڕووێکی خەمناکەوە لووتی بەسەر کابرادا داژەندبوو.

– من ئەم کەڵلەڕەقییە چارەسەر دەکەم، ئەم مانگایە شیرەکەی هەروا لە گوانیدا بێڵێیتەوە خۆی دەکوژێ، دەبێ بدۆشرێ. ئەم مانگا گەمژەیە دەبێ بدۆشرێ. نەک لەبەر ئێمە، لەبەر خۆت.

شەرمین لەسەر کۆمەڵە پووشەکە سمکۆڵی دەکرد، گوتی:

– لێی گەڕێ باوە. ئەنگوستەکانت زۆر زبرن. لێی گەڕێ، من لە تۆ بەبەزەییترم لەگەڵی. تۆ برۆ، بحەسێوە بۆ خۆت باوە.

هەور و هەڵای لێک دوور لێک دوور بەری ئاسمانی تەنی. ئەمەیش شتێکی خواسایی بوو. وەرز وەرزی بارانی پاش پەڵە بوو، باریبا، نەباریبا، بارانی پێشوو ڕەگی بەتۆو داکوتابوو، بنجی بەستبوو.

جوامێر لە دڵی خۆیدا گوتی:

– دەبێ سبەینێ بچم بۆ کێڵگە، هەر هێسترەکە دەبەم، سواری دەبم، دەڕۆم، پێویست ناکا مانگایەکەش بەرم، کۆستکەوتەیە. جەرگسووتاوە. هەر حەوتوویەکە، لە بیری دەچێتەوە. پاشانەکونێ بەخۆ دێتەوە. چ دەڵێی، ئەمەیە ڕەوشتی ڕۆژگار، ئەمەیە رەفتاری ژیان، ئێمە خۆشمان و ڕەشە وڵاخیش و هەرچی هەیە و نییە بۆ ئەوە دەژین، وەرگرین و ببەخشین. ڕەنگە ئەمانەم پێ خۆش نەبن، چونکە لەوەندی دەیدەین کەمتر وەردەگرین، جا ئەمە چ ڕەوای هەقە. ئەی دڵڕەقی و ناڕەوایی چۆن دەبێ. بەڵام پیاو بەچ ڕووێکەوە دەتوانێ ناڕەزایی دەربڕێ. ناڕەزایی لە کێ دەربڕێ و لای کێ؟ لە پاشان وای زانی

کفری کردووە، لە قسەکەی پەژیوان بووەوە و تۆبە و ئەستەغفارێکی کرد، ئەنجا بەخەم و پەژارە و تەنیاییییەکی زۆرەوە حەوشەی بەجێ هێشت. چوو بۆ کن دۆستێکی، دمگۆیەکی تازەی لەمەڕ خێوی کێوە بۆرەوە جاڕ دابوو.

ئەم دۆستە لەوانە نییە درۆ و دەلەسە هەڵبەستێ. ئەگەر ئەو گێڕابێتییەوە مەسەلەکە ڕاست و دروستە.

جوامێر چوو بۆ زنجەکەی پیرۆتی دۆستی. زنجەکە بەسەر قەمە تاوێرێکی زەقی تیژەوە بوو، دەیڕوانییە شیوەکە، تەماشای کرد، پڕە لە خەڵک، جمەی دێ.

کابرای دۆستی پاش خێراتنێکی گەرم و گوڕ، گوتی.

– جوامێر دەزانم تۆش هەر بۆ سەر و سۆراخی ئەوە هاتووی، دە وەرە وەرە لەوێوە دانیشە.

دوو زەلام جووڵەیەکیان کرد و بەیەکەوە نووسان، جوامێر بۆن و بەرامەی تووتنی بۆنداری هەڵبژاردەی وەرزێرانی بەلووتدا چوو، زۆری نەبرد پیاڵەیێ چای خەست و کلۆ شەکرێکی لە پێشە خۆی دیت.

کلۆ شەکرەکەی خستە زارییەوە، یەک دوو جاری خلماندەوە، ئەنجا فڕێکی لە چاکە دا، یەکسەر نیشانەی تەمرەوینەوە لە ڕەنگ و ڕوویدا، کە تۆزێ لەمەوپێش گرژ و لێڵییەک دای گرتبوو، بەدیار کەوت.

مێردمنداڵەکە پیاڵە بەتاڵەکەی گەڕاندەوە.

جوامێر گوتی:

– حەز دەکەم، دمگۆیەکە لە زاری خۆتەوە ببییەم.

– دمگۆی چی جوامێر، دمگۆ نییە. تۆ چۆن دەبینم ئەویشم بەو ئاشکراییییە دیت.

– ڕووت و قووتیش بوو. وایان گوت.

– نەخێر نە ڕووت بوو و نە هیچ. نە برینیش بەهیچ کوێیەکی لەشییەوە هەیە و نە هیچ. تا دەست هەڵبڕی کەڵەگەت بوو. شمەکی وەک مەمانانیشی

لەبەردا بوو. تەنیا کەپەنەکە شڕەکەی نەبێ، ئەوانی تری لە هی خۆمان دەچوو.

جوامێر هەڵی دایێ:

جا تۆ چۆن وا لەم دوورەوە بەم وردییەت بەدی کرد؟ ئەو لەوسەر لووتکەیە و تۆ لە خوارێ، ئەمە چەندی بەچەندە؟

– لەسەر لووتکەکە نەبوو، لووتکەکەی بەجێ هێشتبوو.

– چۆن؟

– کە لێم نزیک بووەوە دەستەوسینە سەرم بۆ دانەواند و سڵاوم لێ کرد. تا بفەرمووی سەرگران و بەویقار بوو. نیشانەی هیچ جۆرە شتێکی، لەوی ترستۆکان بەملیاندا بڕیوە، پێوە دیار نەبوو. سڵاوەکەی وەڵام دامەوە و بەدار ئاساکەی دەستی دیاردیی بۆ ڕۆژهەڵات دەکرد.

– دیاریی بۆ ڕۆژهەڵات دەکرد، دەبێ ئەوەی بۆ چی کردبێ؟

– ویستی تێم گەیێنێ کۆچی لەبەرەو دەڕوا، دیاردیی بۆ دوور کرد. بۆ ڕۆژهەڵاتی کێوەکە.

– یانێ چی؟

– یانێ چی؟ هەیە نەزانێ یانێ چی؟ خێوەکە بەوپەڕی هێمنی و بێ نەفسییەوە دیاردیی بۆ ئەو ڕووکارە کرد بۆی دەچێ.

هەرچییەک بێ ئەوە فاڵێکی خراپ نەبوو بۆ کێڵگەکانمان. دەردە تووتنەکەی ساڵی پار بەسەرمان هات گوناهی ئەوی تێدا نەبوو، تووتنەکە هەر بەشەتڵی ئەو دەردەی گرت.

– ئاوا وایی کۆچی کرد.

– ئەی چۆن، ئەرێ وەڵا کۆچیشی کرد و بەماڵاوایی و دوعاخوازیشەوە. وا منیش ماڵاواییەکەیتان ڕادەگەیێنمێ.

جوامێر بەدڵخۆشییەوە گوتی:

– ئەگەر ڕاستە، با بچین دیدەنییەکی بکەین، دیدەنییەکی ئەو سەری ترۆپکی کێوە بۆر بکەین، ئەو جێی زارکی ئەشکەوتەکە و تاتە مەڕمەڕە شینباوەکەی سەر گڵکۆکەی لێیە.

یەکێ تێ هەڵچوو، گوتی:

– واتا خێوەکە لەو سەر کەژە بوو و ئەمە سوور ڕاست بوو.

– دەبێ وابێ. مادامێکی من بەچاوی خۆم دیتم دەڕوا. هەرچی بەسەر چیاکەوتنەکەشە ئەوە بۆ خۆم زۆرم حەزلێیە و کێی دیشمان لەگەڵدا دێ؟

کەس وەڵامی ئەو خوڵککردنەی نەدایەوە. هێشتا ترس بەقەڵاندۆشکانی هەمووانەوە بوو.

کابرا گوتی:

– کەواتا جوامێر، هەر خۆم و خۆت، لە سبەینێ زووتر نییە، وەسەر دەکەوین.

مقۆمقۆ و دمگۆ و بانگەشە بەنێو ئاواییدا بڵاو بووەوە و ئەفسانەیەکی تازەکوورەی تری پێوە پێچرا، چییە، دەڵێن، جوامێر و دەستەبراکەی بەسەر چیای دەکەون و بەتەمان بچنە بەر مەیدانی خێوەکە و وەدەری نێن، ئیدی هەتا هەتایە چاوی بەم دەوروبەرە نەکەوێتەوە.

جوامێر هێندەی نەمابوو بگاتە دیوی زنجەکەی لای خۆیان، تەماشای کرد، شەش چاو بەتووڕەییەوە ئاڵقەیان داوە.

هەرسێکیان لەو ژوورە بوون کە دایکە نەخۆشەکەی لێ کەوتبوو، هەوڵیان دەدا خاوی کەنەوە.

– ئەوە چییە؟ مانگاکەش مرد.

– کار لە مانگا مردنێ زۆر گەورە و بەرەژوورترە جوامێر.

ژنە ناساخەکە دەنگی پڕ بوو لە تووڕەییەک کە هێزی ترسێکی بەترەف پاڵی پێو دەنا.

– من لە هیچ ناگەم، ئەوە بۆچی هەموو وا هەر یەکە چاوێکتان لێ کردووم بە سێ چاو و سەروچاوم ئاگرباران دەکەن؟

پێڵاوەکانی داکەند، چوو لەسەر جێگەکەی ڕاکشا.

– بەچ هەقێکەوە ئەمە دەکەی، کێ وەسەر ئەم کەڵکەڵەیەی خستی، پیاوەکە.

جوامێر لاقی ڕاستی هەڵکێشا و نووشتاندییەوە، گوتی:

– تێ ناگەم، جارێ هێشتا لە هیچ نەگەیشتووم.

شەرمین زۆر بەشپرزەییەوە گوتی:

– بۆ پیاوێکی وەک تۆ و یەکێکی هاوتەمەنی خۆت چۆن دەکرێ بەگژ خێوی کێوەکەدا چی، لە چیای دەرپەڕێنن؟

– کێ گوتی؟ من ئێستا لە کن پیرۆتی دۆستم دەگەڕێمەوە، چما ئەو پیاوە پێتان وایە چۆنە؟ پیرۆتی وریا و دریا و ئازا.

– لە زنجەکەی ئەوەوە خەبەر بڵاوبووەوە. ناوبەناو هێندێ دانایش وریایی و دانایی خۆیان ون دەکەن. نەکەی بەسەر چیا کەوی، باوە نەکەی، کەس ناتوانێ خێو ببەزێنێ. ئەگەر هەر لەسەری سووری بەلانی کەم، بەئاوەز شێواوی لەوێ دەگەڕێیەوە ها، ئەقڵت تێک دەچێ.

– من پێم گوتی؟ پێم گوتی خێوەکە کەژەکەی بەجێ هێشت؟ پیرۆت بەچاوی خۆی دیویە، سەری بۆ نەوی کردووە، ماڵاوایی لێ کردووە، خێوەکە ڕۆیشت، ڕووی لە خۆرهەڵات کرد، بەدار ئاساکەی دەستی دیاردیی بۆ ئەو ڕوو کارە کردووە بۆی چووە. خێو بۆ خۆی ڕۆیشت، کەس دەری نەکرد.

– ئەمە ڕاستییەکەی نییە. تۆیش وەک مام پیرۆت زۆرت ڕک لە خێوەکەیە، هێندەی لێ هەراسان بوون تا کارتان گەیاندە ڕادەیەک بیر لەگژڕاچوون و وەدەرنانی بکەنەوە.

– نەخێر، ئەمە ڕاستییەکەیەتی، شەرمین. ئەمە ڕاستییەکەیەتی و بێ کەم و کورتیش. دەبێ بەسەر لووتکەی چیا کەوین، منیش و پیرۆتیش، پیرۆت پیاوێکی ئازایە و هەرچییەکی دەیڵێ و دیویە ڕاست دەکا، من لە قسەکانم

دڵنیـام و قــەتی دەست بەڕووەوە نانێم. ئەمـە دوا قـسـەی بنـبـڕمـە و نامـەوێ بڕیارێکی دابێتم کەڵەوەکێشییەکی تازەی تێدا بکەم. بڕیاری خۆم داوە و شان بەشـانی پیرۆت بەسـەر لووتکەی چیا دەکەوین. لە سبەینێ زووتر نییە بەسـەر دەکەوین. جا بۆ ئەوەی وچانێ بدەم کەس نیگەرانم نەکا.

پێش ئەوەی پێڵـووی لێک بنێ و سەردرە ئەسـتوورەکە بەلەشـە لاوازەکەی دا بدا، گوتی:

– مانگاکە حاڵی لە چدایە شەرمین؟

– چاکە باوە. ئالفێکی زۆری خوارد و گوانیشی شیرێکی زۆری دا.

– کەواتا گـەلۆرە ئاخـرییـەکەی لە کەلی شـەیتـان هاتـەخـوار، دەبوایست ئەو هەموو شیرە لە گوانیدا ڕەق ببێ.

– ئەرێ وەڵڵا باوە چاوی گەشایەوە، کە دۆڵکە ئاوەکەم بۆ برد، لە من وابوو بەپیرمەوە دێ و خێراتنم دەکا.

– دەئیتر بەسە، مادامێکی دەتەوێ بحەسێیەوە. بخەوە بۆ خۆت جوامێر، بۆ ئەوەی دەڕۆستی خێوەکە بێی.

جوامێر پێی ناخۆش نەبوو، بەڵام ڕووی بەلای دیوارەکەدا وەرگێڕا، ها مانا گوێ بەو قسانە نادەم.

بۆ ســبــەینێ هەتاوەکــەی وەک ڕۆژانـی بەهار تـا بلــێی خــۆش بـوو، بەری ئاسـمـانی ســامـاڵ و بێ گـەرد، بەحـەوتووێک بـەشی مـانگێ باران باریبـوو، ئێـسـتـاکـە بێ لە بایەکی سـارد کـە لە ڕۆژاواوە هەڵی کـردبوو و هەڕەشـەی بەزسـتـانێکی تووش دەکـرد، چیی تر لە نیـشـانـەی زسـتـانێکی دشـوار نەدەبیندرا.

جوامێر بەرگە ئەستوورەکانی لەبەر کرد، گۆرییەکی زێدەی لە پێ هەڵکێشا، لاپچـینە ئـەسکەرییـە کـۆنەکـەی لە پێ کـرد، بەگـۆرییـە ئەسـتـوورەکـانیـیـەوە بەڕەحەتی بەپێوەی چوو. شاڵەکەی توند توند لە پشتی بەست. ئەنجا ڕوانییە تفەنگەکەی کە لە ژوورە سەرییەوە هەڵاواسرابوو، بڵمەبڵمێکی لێوە هات:

– ئێستاکانێ تەواو لەبار و هەمووارە. تفەنگ یا داستانی ئازایەتی و گەڕناسییە، یا دێرۆکی ترسنۆکی و نامەردییە. من باوکم وەک هەموو ناوچەکە دەزانێ، ئازا و کەڵەمێرد بوو و ئەم ئازایەتی و کەڵەمێردییەم لەوەوە بۆ ماوەتەوە. وێڕای ئەوەی کە چاوتیژییەکەم نەختێ داوێتییە کزی، بەڵام لەوە دڵنیام کە هەموو نیشانێ دەپێکم.

ئافرەتە دەردەدارە توورەکە بەدیوی چەپدا وەرگەڕا، دەم و چاوی ڕکی لێ دەباری:

– کەواتا لەسەر ئەوە سووری بەسەر چیا کەوی و لەگەڵ خێوەکەدا بەشەڕ بێی جوامێر؟

– بەڵێ بۆ ئەوێ دەچم، لەگەڵ پیرۆتی دۆستمدا دەچم، ناشێ ئازایەتیی ئەم پیاوە سەرڕاستەت لەبیر کردبێ. جا خۆ ئێمە بۆ ئەوە ناچین لەگەڵ خێوەکەدا بەشەڕ بێین. بۆ ئەوە دەچین، بزانین ڕاستە کۆچی کردووە. پیرۆت بەچاوی خۆی دیویە ڕۆیشتووە. سڵاوی لێ کردووە، ماڵاواییی لێ کردووە. بەدارئاساکەی دیاردیی بۆ بەرەو ڕۆژاوا کردووە. ئێستا سەلماندت؟ من دەزانم تۆ لە ترسان نایسەلمێنی، ترسیش وەک ئازایەتی ئاکارێکە لە باو و باپیرانەوە بەجێ دەمێنێ. ناشکوری نەبێ خۆ ماڵە باوانە زل و زەلامەکەت پیاوێکی ئازای لێ نەکەوتەوە.

شەرمین گوێی لە هەموو دەمەتەقێ و مشتومڕەکە بوو، ئێستا و ئەوسا تێبینییەکی دەرنەبڕی. دوێکە تا نیوەشەوێ، چەندی لەگەڵدا کرد و کراند، نەیتوانی پەشیمانی کاتەوە. ئەوەتا ئێستا ناچار ملی بۆ باوەی پیر خەواند.

تفەنگەکە بەدیوارەکەوە هەڵاواسرابوو، لە مێخەکەی کردەوە، گوتی:

– پڕە، لەسەر پێیە. هەر ئەوەندی پەنجە بەپەلەپیتکەکەیدا بنێم یەکیان لار دەبێتەوە و لە خوێنی خۆیدا دەگەوزێ. یا ڕووی لە سینگی خۆم بکەم هەموو شتێ دەبڕێتەوە.

– ئەرێ دوێنێ ئەوەندەت ئاڵف بەهێسترەکە دا تێری پێ بخوا؟

شەرمین شاڵینەیەکی خوریی شینی بەسەر قژە خورماییییەکەیدا دابوو، بەسەر ڕاوەشاندنەوە گوتی:

– بەڵێ و ورتەنەکردنی ئەوەی گەیاند هامانا نەیتوانی لەو مەترسییەی پەژیوان کاتەوە.

– هەموو شتێ ئامادە و تەیار بوو.

– لە زنجەکە بەدەرکەوت، ڕێشمەی هێسترەکەی کردەوە، سواری بوو و دای کێشا. زۆر نەڕۆیشت. بەسەر پشتی هێسترەکەوە لوولەی تفەنگەکەی نەختێ بەلارییەوە ڕووەو ئاسمان گرتبوو. لە ناکاو تووشی هەیت و هووتی پیاو و ژن و زارۆکان هات، ورد و درشت بەچوار دەوری پیرۆتی هاوڕێیدا ئاڵقەیان بەستبوو و ئەویش وەک خۆی کۆک و تەیار بەسەر ئەسپە ڕەشکوێتەکەیەوە شنگڵی لە خۆ دابوو و ئەفسانە تازەکوورەکە بیانگەی بۆ ڕەخسا، سەرلەنوێ دەماودەم بکا و بەسەر زارانەوە بگەڕێ.

– دوو کەس لەگەڵ خێوەکەدا بەشەڕ دێن و لەو سەر چیا بەدار و درەخت و بەروبووە قەوغایەی دوور دەخەنەوە.

– پیاوی گەڕناس و ئازا بەسەر چیا دەکەون و لەگەڵ خێودا بەشەڕ دێن.

– دەبوا وەرزێرەکانیش هەر کەسە لای خۆیەوە ئەمەی کردبا. خێوەکە دەستی بەهەڕەشەکردن و هەڕ و گیف کردووە، گوایە ئەو جۆگەلە چکۆلانەی لە کانییەکانەوە ئاویان پێدا دێ، دەگرێ و وشکاو بەمەزرا و کێڵگەکانیان دێنێ.

– ئازا و مەردانە بە پیرۆت.

– جوامێر مەترسە، دوودڵ مەبە، هۆ بەنێچیروانی هەرە چاکی ئەو کێوە ناسراو.

کابراگەل هەر لە خۆیانەوە تەزووی فیز و شایی بەخۆبوونێکیان پێدا هات. هەر لەو ڕێگەی کێڵگەیەوە کە هەموو جارێ پێیدا دەڕۆیشتن، بەرەو کێوەکە بەڕێ کەوتن.

جوامێر پێش ئەوەی لە چاو ون بێ، هەر کە لای تاوێرەکان پێچیان کردەوە، ئاوڕێکی پاشەوەی دایەوە، قاقا دایە پێکەنین.

– بە چی پێ دەکەنی جوامێر؟

– پێم وابوو هێندێکیان بەپێیش بوایە، تا وێروەتر لە دوومان دەهاتن.

– لەوە ترسان نەکو بەتـۆبزییان بەرین. دیارە هێشتا خەڵک ترس و بیمی لە خێوەکە، هەرچەند کۆچیشی کردووە، نەشکاوە.

دوێکە بەدرێژاییی شەوگار بەگومانەوە تلامەوە و ئەم دیو و ئەو دیوم کرد. تۆ لەوە دڵنیای خێوەکە کۆچی کردووە پیرۆت؟

– زۆریش، ئەی لات وایە ئەوەندە ئەحەمەقم هەروا لە خۆڕایی مل لەو دووبەختییە دەنێم و هەروا کوێرانە بەسەر کەژێ دەکەوم خێو داگیری کردبێ.

– لە ماڵەوە زۆریان هەوڵ لەگەڵم دا ئەم خێودیتنە بەدرۆ بخەمەوە. دەیانگوت پیاو لە خەڵوەت و تەنیاییدا خەیاڵ لە زۆر شت دەکاتەوە. دەشێ.

– بەڵێ، دەشێ جوامێر، بەڵام من بەڕاستمە و کاتێکی خێوەکەیش کۆچی کرد من ئاگادار بووم. خۆ هیچ نەبێ تۆ بۆ خۆت دەزانی من ترسنۆک نیم. ترس خەیاڵ پڵاو بەبنیادەم دەکا.

– ڕاستت دەوێ، دەبێ تۆ لەسەر هەق بی.

بڕوانە جوامێر، بارانەکەی دوایی چیی لەو زەوی و زارە کردووە؟

– دیتم دیتم چی ڕووی داوە. ئەوە هەمـوو ساڵێ ڕوودەدا، ئەو تۆوەی بەدایکە زەوییانەوە ناچەسپێن وردە سێڵاو بەرەو نشێوان ڕایان دەدەن، لە خوارێ کەڵەکە دەبن، کێڵگە تووتنەکەی منیش بڕێ لەو تۆوە گەنمەی تێ دەکەوێ. دەبوو بەستێکی ترم لە سەرووی کێڵگەکەوە هەڵبەستبا، بەری گرتبا.

– جا ئێستا؟

پیرۆت گوتی:

– ئێستایش ئەوە سەر چیاکەیە، ڕۆژیش قەت لەم ڕۆژە خۆشتر نابێ.

– جا بەڕاستی ڕۆژێکی خۆشە، پەڵە هەورێکی چکۆلەی هەور ئاسایی بەئاسمانەوە نییە. تەنانەت زارکی ئەشکەوتەکەیش.

– ڕووناک دیارە، ڕووەو ڕۆژە، بەم ڕۆژگارە بەو بەر تیشکەوەیەتی، سۆمای چاو دەبا.

– ئای لەو هەمـوو بەروبووەی، خەڵک لەو بن دارانەی دەبیننەوە، هەر وا دەکەی بەروبووە. ئەی ئەو هەموو دار و دەستەکە وشکەی بۆ دارەڕا و پەرژین و تەیمانمان پێ دەوێن.

پیرۆت مامزەیەکی لە ئەسپەکەوەی ژەند و جڵەوی بەرەو سەر چیاکە بۆ شۆڕ کرد، قەیرێ کرکپ، کشوماتی دای گرتن.

تاشەبەردی گەورە گەورە خوا بۆ خۆی دەزانێ لە چەند هەزار ساڵەوە بەدەم داخوران و داڕووخانەوە لەسەرڕا غلۆر بوونەتەوە. لە تارماییی زەلام و دەعبا و مەعبای سەیر و سەمەرە دەچوون، پیاو پێکەنینی پێیان دەهات و لێشیان دەترسا. هێسترەکە لە ڕێچکەی تەسک و بزنەڕێ بەسەرکەوتندا لە ئەسپەکە بەگوڕ و توانتر بوو، بەڵەد و شارەزاتر بوو. هەمیشە هەر ئەو لە پێش ئەسپەکەوە دەڕۆیشت.

– لە ڕێچکەکەی ترەوە. با ڕووبەڕووی زارکی ئەشکەوتەکە نەچین.

– بەڵێ بیرم لێ کردووەتەوە. کاتێکی دێ، لە ئەشکەوتەکە بچێتە ژوورەوە یەکڕاست بەرەو ڕووی دێین.

– پێم گوتی، ڕۆیشت. بۆ بڕواناکەی، ئێمە هەر بۆ ئەوە بەسەر دەکەوین، بۆ ئەوەی هێندەی تر دڵنیابین. ویستم بەپشت لووتکەکەدا وەرچەرخێمەوە، گوتم، بزانم چ دەبینم.

هەردوو زەلام لە وڵاخەکانیان پەلاوێژێ دوور کەوتنەوە، سەنگەریان گرت و ئەنگوست لەسەر پیتکەی تفەنگ.

هەر هێندەی چاوترووکاندنێکیان مەگەر خوا بۆ خۆی بزانێ، چۆن لێ بەسەرچوو، سەخت و هەستەم، مەگەر هەر ئەو کەسانە بیزانن کە بەسەریان

هاتووه. چەند هەناسەیەکی بەسام وەک تارماییەکی سەرتاپا ڕەشاییی بەر تریفەی مانگەشەو.

سەرێ لە پشت گاشەبەردێکەوە، کاڵ و سپیواش بەدیارکەوت، جوامێر مچوڕکێکی بەلەشدا هات. ناڵەی گوللەیەک دووان نەبوایە جووڵەی نەدەکرد.

دەنگێ بڵیند بووەوە، لە زریکە دەچوو.

پیاوەکان پشوویەک هەستیان ڕاگرت، قەدەرێ بێدەنگ بوون، سەیریان کرد، وا پێ دەچوو کەیفخۆش بوون. هەر کە زریکە و قیژەکە نیشتەوە هەردووکیان یەکڕاست هەڵیان کوتایە سەر نیشانی تاین. بەڵام چی ببینن. لە پشت ئەو گابەردە زۆپەی نزیک کەڵەکە بەردە شاخاوییەکەوە کە پێیان وا بوو گۆڕخانە و ماڵی خێوەکەیە، خۆێنی گەرم و گەش هێشتا پێچاوپیچ ڕێی دەکرد. کەللە سەرێکی زل بەسەر گابەردێکی زۆپەوەیە و چۆڕاوگەی خوێن نەخشاندوویە.

جوامێر هەڵچوو:

– ئەمەت بۆ کرد پیرۆت خواکەی نەتگرێ، تەماحت چووبووە کەوڵەکەی؟ بۆ ئێمە بۆ ڕاوی ئەم ورچە پیرە بەسەر چیا کەوتین؟ ئەمە ورچە و هیچی تر.

جوامێر هەوڵی دا، پەنا گابەردێ بدۆزێتەوە، کەلاکی ورچەکەی بۆ پەلکێش کا، لە پاشان گوتی:

– ئا تۆیش دەستێکی بدەیێ، زۆری دوور ناخەینەوە، هەروا لەوێ، بەگەڵا و چوکڵ و چێوی ڕزیو، دەیشارینەوە. کارەکە بڕایەوە. بەڕاستی زۆر گێل و گەمژە بووین.

– بۆچی گێل و گەمژە بووین، پیرۆت؟

– چونکە ترسنۆک و بوودەڵە بووین. بەسەر چیا نەکەوتین، بزانین ئەم خێوە چییە؟ تومەز خێوەکەیش لەم ورچە پیرە بەولاوە چیی تر نەبوو.

جوامێر هەناسەیەکی دا، گوتی:

– کە ئاوەزپێتەوی و ئازایەتی هەرتک لە پیاودا کۆببووەوە، ئەوە ئەوپەڕی

ژیری و کاملّییه.

کەلاکەکەیان بە بەرد و گەڵا و چوکڵ و چێوی ڕزیو وەشێرد، کە لێبوونەوە بەفیزێکەوە ڕاست بوونەوە، تا چاوی تیژ بڕبکا سەیرێکی هەرە دووریان کرد.

– دوندی چیا زۆر چڕ و قەوغاتر بووە.

– بەبار گوێزی لێ هەڵگرەوە.

– ئەمە هەمووی ترس لێی قەدەغە کردبووین. کار لەوە بەسام و هەستەمتر دەبێ هەرە ئازای خەڵکەکە نەیەوێ بەسەر لووتکە بکەوێ. زەوییەکی قۆرخ بوو، لە خێو ترسان پاسەوانیی لێ دەکرد. ئەوەتا ئەوەی بەچاوی خۆت دیتت، دیتت.

– بەڵام خۆ تۆیش زۆر جارت خێوەکە دیتبوو، پیرۆت، هەر خۆشت خەبەری کۆچکردنیت بڵاو کردەوە.

– باشە ئەگەر بڵێم ئەو خەبەرە خۆم هەڵم بەستبوو، خۆ بەچاوێکی ترم سەیر ناکەی؟ جوامێر ئەمەم بەخەیاڵ هەڵبەست، چەند ڕۆژێ لەمەوپێش بەسۆ کەوتم ئەو خێوەی دەماندیت خێو نەبوو. گوتم هەبێ و نەبێ، شتێکە دەجووڵێتەوە یا پیاوچاکێکی گردەنشینە لەو ئەشکەوتە، یا گیانلەبەرێکە لە گەلە دابڕاوە و ئاوەکی کەوتووە، لەم بەگومان و بەسۆکەوتنەدا چیم بۆ نەمایەوە ئەوە نەبێ کردم.

جوامێر دەستە بەخوێن و خوڕە کزربووەوەکەی بەبەردێکی زبر سڕییەوە و دای کێشا.

پیاوەکان هیچیان سواری وڵاخەکانیان نەبوون، هەرکەسە جڵەوی وڵاخی خۆی گرتبوو و وەدووی خۆی دابوو. بەبێدەنگی و لەسەرخۆ هەردووکیان پێکەوە لە ڕاستانە بەردەڵانە تەنگەبەرە ڕژدەکە گەیشتنە کلکەی کەژەکە.

جوامێر پرسی:

– باشە پرسیاری زۆر و زەوەندەی ئاوایی بە چی بدەینەوە؟

– چاتر ئەوەیە یەکێکمان قسە بکا و ئەوی ترمان شایەتیی بۆ بدا،

حەکایەتەکەیش لە جارێ زیاتر نەگێڕینەوە.

– ئەمە لە هەمووی چاترە. جا لەبەر ئەوەی تۆ لە من زۆرتر دەزانی و لە من بە شان و شکۆتری تۆ دەکەوییە قسان، بۆ شایەت و دەست بەسنگدادان نەبێ متەق ناکەم.

– یا بۆ بەبیرهێنانەوەی وردە شتێک، خۆم لێت دەپرسم.

– وەی بەسەرچاو، هەرتۆ و ئەمە؟ جڵەوی ئەسپەکەت بۆ بەرەڵڵا کرد پیرۆت تا جارێکی تری دەگەیێ بەهیلاک دەچی، تۆش وەک من بەمەشوور بە، گیانلەبەر بەدوای هەوەس و ئارەزووی خۆیان دەکەون.

– من ئەسپی خۆم دەناسم، زۆر هۆگر و ڕامە، بستێکم لێ دوور ناکەوێتەوە. نامەخوا لە جوانیی ئەم ناوە، ئەفسانەکەی تێدا مرد بڕایەوە.

– باوەڕ ناکەم بمرێ پیرۆت. ئەو شتانەی زۆر دەژین وەختێکی زۆریان بۆ لەبیرچوونەوە دەوێ.

– دەزانم، بەڵام چاترین شتێکی کردمان ئەوە بوو، ئەم ئەفسانەیەمان لە بنەڕەتدا ڕووخاند، ئەو دوواکەی، ڕۆژگار زامنێتی. لە پێشان ئازا و کەڵەمێردان بەسەر چیا دەکەون، ئەنجا، بەرەبەرە، نەخێو دەمێنێ و نەشوێن و شوێنەواری، خانەخوێیی چیاکان دەست هەموو خەڵک و خوای ئەم گوندە زۆر و زەوەندە پرش و بڵاوە دەکەوێتەوە.

– بەڵێ، لەوانەیە ئەمە بەدی بێ، بەڵام وەختی دەوێ. کێناڵێ ئەفسانەیەکی تریش لەمەڕ چیا ناکەوێتەوە و هەر لەسەر ڕەگ و ڕیشەی ئەفسانەی خێوەکە هەڵناداتەوە. ئەدی وە نییە پیرۆت؟

– لەوانەیە هەڵبداتەوە. زۆرمان لە باو و باپیرانمان بیستووە، کوا چییان لێ هات؟

– هەر سەردەمە و،

– بەڵێ دەبێ ئەفسانە پەیدابێ بۆ وەخت کوشتن.

جوامێر سووک ڕاست بووەوە، چاوێکی بەدوندی چیاکەدا گێڕا، تەماشای

کرد، زارکی ئەشکەوتەکە تاریکە، ڕۆژی لێ ئاوا بووە، هاواری کرد:

– ئەوە خێوەکەیە. ئەوەتا جارێکی تر پەیدا بووەوە، بڕوانە،

پیرۆت بەدەنگێکی خەمناکەوە گوتی:

– بەڵێ ئەوە ئەوی تریانە، ورچێکی ترە، لەوە دەچێ مێچکەی ئەو ورچە بێ کە کوشتمان، ئەمە ڕاستییەکەیەتی جوامێر. ورچ بەتەنیا هەڵناکا. ڕەنگە بێچووشیان هەبن، وردە وردە هەراش دەبن. جا دەبێ ڕاستییەکەی لە خەڵکی ئەو دێهاتە هەژارانە ڕاگەیێنین کە لێرەوار و چیا جێگای حەشاماتەکەی خۆیانن، هی خێوی خۆیانن، چونکە لەوێ پەیدا بوون.

– ئەی ئەو ورچەی کوشتمان، پەلەمان تێدا نەکرد پیرۆت؟

– بمزانیبا ورچی تری لێیە ئەوەم نەدەکرد، تازە ڕابرد، پەشیمانیی ناگەرەکە.

– گەشتێکی نالەبار و سەخت بوو، هەراسانی و غایلەیەکی زۆرمان بەدواوەیە، هیزە با خێراکەین.

– بگەڕێینەوە، کەین و بەینەکە وەکو خۆی لەو خەڵکە ڕاگەیێنین.

– هێندەش بڕوامان پێ ناکەن، وا دەزانن لە ترسان بەسەر دوندی چیا نەکەوتین و خۆمان ئەم بەیت و بالۆرەی ورچ کوشتنەمان هەڵبەستووە، تۆش پێت وە نییە؟

– ڕەنگە، بۆچی نا؟ بەڵام مادامێکی ئێمە بەرەوڕووی ئەو ڕاستییە بووینەوە چاتر وا نییە بەرەوڕووی خەڵکەکەیشی کەینەوە. یانەکو شتێکی ترت لە دڵدایە؟

– منیش لەمە بەولاوە چیی دیکەم لە دڵدا نییە پیرۆت، چیی دیکە نییە.

پیرۆت هەڵستایە سەر پێیان بەکاوەخۆ لە ئەسپەکەی نزیک کەوتەوە، ئەسپی تایەن هێندە هۆگر و ڕام ڕووی تێ کردبوو، دەتگوت خۆی ڕێشمەکەی لە ناو دەستی نا، هەر وایەکی کرد بەسەر پشتی کەوت، جوامێریش ڕێشمەی هێسترەکەی لە مێژ بوو بەدەستەوە بوو، وەک ئەو خۆی بەسەر ملیدا هەڵدا،

سوار بوو.

– هێندێ تۆو خەریکە گیانی تێ دەگەڕێ.

– دیتم.

– ئەم ساڵ چەند تووتن دەچێنی؟

– بیرم لە دۆنمێ کردبووەوە، لە پاشان پەشیمان بوومەوە. نیو دۆنم دەچێنم.

– بەڵام تۆ زەویت پتر هەیە.

– زۆری چی خوا سەلامەتت کا، هەمووی بوو بەبوورە، کەڵکی تووتن چاندنی پێوە نەماوە، پیرۆت.

– جا بیکە بەدەغڵ و دان.

– گاڵ و هەرزنم لێ تاقی کردەوە دەسکەوتەکەی نائومێدی لە دوا بوو، زۆر خوێڕی و مایەپووچ بوو. سەروبەریشی نەهێنا.

– من دەمزانی، بۆیە نەمچاند، ئەرێ بەڕاست کەیوانۆت چۆنە؟

– وەڵڵا هێشتا هەر بەو نەخۆشیی سینگەوە دەتلێتەوە. ناوبەناو وای دەتاسێنێ هەر ئەوەیە نایکوژێ. لە دووکەڵ زۆر وەڕەز و هەراسان دەبێ. هەر لەبەر ئەو وازم لە جگەرەکێشان هێناوە لە ژووریێ.

– ئافەرین بۆ خۆت و ئەمەگداریت، بەڕاستی ژنی چاک بوو بەجحێڵی.

– بردەباری و خۆبەختکردنی هەرگیز لەبیر ناکرێ، بەڵام خۆت دەزانی، جارێ وا لە سەرەتای زستاندایین پیرۆت، سەرماوسۆڵەیش ئاورودووی دەوێ، ئەویش بەدووکەڵ نیگەران دەبێ، سووتەنی بێ دووکەڵ دەبێ؟ تەنانەت پاش ئەوەی کە دەبێ بە سکڵ و پشکۆی سوور و گەشیش.

– خوا هاریکارت بێ جوامێر، ئەی شەرمین لە چیدایە؟

– ئەویش ئەوە دوو ساڵە دەستی لە خوێندن هەڵگرتووە.

هەرکە دایکی نەخۆشییەکەی لێ پیس کرد، ناچار وازی لە خوێندن هێنا.

بەڵام ئامینە هەر دەخوێنێ، ئەویان بەتەمایە ببێ بەفێرکار.

– زۆر چاک دەکا. هەرچەندە بۆ تۆیش زەحمەتە. ئەی شەرمین هێند تووڵەک نەبووە وەختی بەشوودانی هاتبێ؟

پەسنی جوانی و شۆخیی زۆر دەدەن. کەس خوازبێنیی نەکردووە؟

– لەم دووایینەدا دوو جاریان داخوازیی کرد، ڕازی نەبووین.

– هێشتا زۆرم پێ دەوێ بۆ کار و فرمانی ماڵێ.

– بەڵێ هەقتە.

بڵیندایی گوندەکان بەزنج و کۆلیتە نەوی و پەرت و پەراگەندەکانییەوە، لە دوورەوە بەدیارکەوت. لە پێشان پیرۆت خەڵکەکەی بەیانی بەڕێیان خستبوون دیت، گوتی:

– هێندێکیان هێشتا هەروا چاوەڕێ دەکەن.

– هەر لەو شوێنەیش.

– ئاخۆ ئێستا دڵیان چ پکا، چەند دڵخورت و نیگەران بن. وا گەڕاینەوە، وەک تەگبیرمان کرد، تۆ قسان دەکەی هەر تۆ قسان دەکەی، پیرۆت.

پیرۆت سەری ئەسپە کوێتەکەی بەچەپدا وەرچەرخاندەوە، ملی کورتە ڕێیەکەی بەرەو ماڵی خۆیانی گرت.

## ٣

جـوامـێـر لەپاش نیـوەشـەوێکی درەنگ بەترس و سـامـەوە لە جێ ڕاپەڕی، ڕووداوەکەی دوێنێ بەسـەری هاتبوو پرس و پرسـیاری زۆر و زەوەندی لەمـەڕ خێوە بۆر خەویان لێ هەراسان کردبوو.

هەردوو کچەکانی بەهەڵەداوان بەلایەوە هاتن.

شـەرمین بەچوونەبەر مەیدانەوە گوتی:

– باوە تۆ بەرەو هەڵدێر دەچی، بیر لە ئێمە ناکەیەوە.

وشە تفت و تیژەکەی قووت دایەوە، گوتی:

– من لە پێناوی ئێوەدا ژیاوم و دەژیم شـەرمین. بەدخوو مەبە.

– نابم باوە، بەڵام تۆش دەبێ واز لەم بەرەو هەڵدێر گلۆربوونەوەیە بێنی.

– من بەرەو هەڵدێر دەڕۆم شـەرمین؟

– ئەی لـەوە ناچـێ باوە، تـەنانـەت پـلـە و پایـەت لای ئـەوانـەی ڕێزیـان لـێ دەگـرتـی دەدۆڕێ و بەچاوێکی کـەمـەوەت سـەیر دەکـەن، لە داسـتـانبـێـژیی کابرایەکی ملهوڕانە بەولاوە چیی دیکەت بۆ نامێنێتەوە.

– کارێکی ملهوڕانـە بوو شـەرمین. ئەفسـانـەی خێوەکـەی ئەو کێـوە لەوێ بەسەرکەوتین، ئەمەیش ڕاستییەکەیەتی، درۆشمان لەگەڵ کەسدا نەکردووە.

– خەیاڵ بەزاندنی باوە.

ژنە دەردەدارەکە هەڵچوو، گوتی:

– شـەرمین بیبڕەوە، ئەوە تۆ، لە کـەیەوە بووی بەو کچە بەم زمـانە بەرپەرچی باوکت بدەیەوە. ئەوە ناماقـووڵییـە بۆ تۆ. باوکت خـۆی لە کـاری خـۆی دەزانـێ. کە باوک بەنێو سـاڵدا چوو دەبێ پتری ڕێز لێ بگیرێ، دەی جوامێر، بەتەما

بووی چی بگێڕییەوە. لەوە دەچێ خەوەکەت زۆر ناخۆش بووبێ. گوێم لێ بوو وڕێنەت دەکرد، داوای کۆمەگت دەکرد. هەقتە جوامێر.

– زۆر ناخۆش بوو، لە گێڕانەوە نایە.

– چی ناخۆش بوو جوامێر؟

– ئەگەر ڕاستییەکەی وەک خۆی دەگێڕییەوە خەڵک بڕوات پێ ناکەن.

– چ دەڵێی، خەڵک هەروا فێربووە جوامێر، لە خەڵک گەڕێ بۆ خۆیان بنوون، هێشتا بەرەبەیان لە کوێیە.

– ناکرێ بەتەنیا بمێنمەوە ژنە ئازیزەکەم.

– کەس بەتەنیات ناهێڵێتەوە جوامێر.

– کە کەس بڕوام پێ نەکا چیم دیوە و چی دەڵێم، بەتەنیا ماومەوە. ئەی بەتەنیا مانەوە شاخی هەیە باڵی هەیە؟

– چۆنت لە دڵ دێ پیاوەکە. هەتا هەتایە لەگەڵتدام.

– هەروەکو لە سەرەتاوە، دە بڵێ، دەی، دە قسە بکە.

– خێر بێ، خەونێکی بەسامم دیت.

– ئێمەیش چاوەڕوانی ئەوەبووین. ماندوێتیی ڕۆژگار خەونی ناخۆشی لە دووە، خەونەکە چۆن بوو، خۆ لە بیرت نەکردووە؟

شەرمین لە پاینی دایکیەوە دانیشتبوو، ئامینە نەتدەزانی لەسەرمان، لە ترسان هەڵدەلەرزی.

جوامێر گوتی:

– من بەدەگمەن خەون لە بیر دەکەم، خەونیش تا قووڵتر بێ، هێندە زێتر بەبیر دێتەوە.

– خەونەکە چ بوو؟ خۆ جارێ هیچت لێ نەگێڕاوەتەوە.

– ڕاست دەکەی، خەونێکی پڕ کارەسات بوو. لافاوە گەورەکەم دیت، وەک شەپۆڵێکی گەورەی دەریا بەسەر گوندەکەیدا داین، هەرچییەکی بەرکەوت ڕای

ماڵی. چونکە شەو بوو کەس فریای کەس نەکەوت. لاسامە و لافاو بەقوڕە لیتە و ئاومالکەوە بەجارێ ئاواییی ڕاپێچا، سەرلەبەری ڕاماڵییە ناو شیوەکەوە.

– ئەمە خەونی ڕووتە و هیچی تر. ئەمەی بەخەون دیوتە لە ترس بەولاوە چیی تر نییە. هەر ئەو ترسەیە سەرانسەری ژیانی لە کاتی بێداریشدا لێ تەنیوی، چونکە ئاوەڕۆکە بەو پێیە بێ تۆ دەیبینی بەشی ئەو هەموو سێڵاوەی ئەمساڵ ناکا پێوەی بڕوا.

– بەڵێ.

– ئەی خۆ هیچ ڕووی نەدا.

– هەربینا بەم نزیکانە ڕووی دا، چەند لە ژمارەی ئەنگوستەکانی دەستم لەوە دڵنیام ئەوەندەش لەوە دڵنیام. جا لەبەر ئەمە،

– جا چ دەڵێی جوامێر؟

– دەڵێم شەرمین و ئامینە بۆ مەودای حەوتوویەک بنێرمە کن پووریان بۆ شار، پێچی مێزەرێکە، هەموو شتێ دەبڕێتەوە. تێم دەگەن چ دەڵێم، ئەوەی دیتوومە لە خەون گەورەترە. هەڕەشە بوو، ناتوانم هەموو ئاوایی ڕزگارکەم، چونکە بڕوام پێ ناکەن، هیچ نەبێ با کەس و کار و خێزانەکەی خۆم ڕزگار کەم.

بارانێکی زۆر لەو کەژە دەبارێ، لافاوێکی وا هەڵدەستێ ئاوایی سەرلەبەر ڕادەماڵێ، دەمەوێ لە بارەکە سووک کەمەوە، لە لافاوەکەت قوتارکەم ژنە بەڕێزەکەم.

ئامینە هەڵی دایێ:

– ئەی خوێندنەکەم؟

– لە حەوتوویەک پتری لێ دانابڕێی.

شەرمین گوتی:

– پیاو کە بڕوای بەخەون کرد و لەسەر بەدیهاتنی سوور بوو، ئەوەش بزانە کە لە پڕوپووچ بەولاوە چیی تر نییە، ئەوساکە ژیان بەرەو...

– بەرەو چی شەرمین؟

– دایکە قیژاندی: بەلای مێردەدا داتاشێ، گوتی:

– دەی بزانم ژیان بەرەو چی دەڕوا شەرمین. دە بڵێ، دەی.

– بەرەو بارێک لە توانست بەدەر دەڕوا.

– جا بۆ ئەوەی لەوە ڕزگار بین دەبێ لە دژ مەرگ خەبات بکەین، چونکە حەز لە مەرگ ناکەین. تا قایمتر دەست بەقوڵفی ژیانەوە بگرین دەتوانین خەبات پتر بکەین. بەری بەلای مێردەکەیەوە کرد، گوتی:

– بەتەمای چی بەکچەکاندا بۆ پووریێ بنێری، ناشکوری نەبێ ئەویش بێوەژنێکی کەساسە و بۆ پارووە نانێ بۆ هەردوو سێوییەکەی بەلاس و پەلاسدا دەچێ. بەنانەوایی بەڕێوە دەچێ. نان دەکا و بەکارمەندانی دەوڵەتی دەفرۆشێ. ئەویش بەهەزار ناری عەلی نشوشتیی پێ ڕاست دەکاتەوە و لە گوزەرانێکی نەمر و نەژی بەولاوە چیی دیکەی لێ هەڵناوەرێ.

– دەزانم، زۆری لە کن نامێننەوە، وێڕای ئەوەش جۆرکێ هەرزن و هەرچییەکمان ڕۆن لە ماڵێ هەیە و هێندێ شتی تری، ئەوەندەی هێسترەکە پێی بچێ، بۆ دەنێرم.

– مادامێکی هەرتکتان وای بەچاک دەزانن قسە بێهوودەیە. ئامینە هەستە با خۆمان کۆ کەینەوە.

سبەینێ زوو، کە جوامێر بۆ دەسنوێژشوشتن وەدەرکەوت، تەماشای کرد بەری ئاسمان ڕەش و تاریکە، کزەیێکی ساردیشی دەهات. پێشبینییەکانی هێندەی تر چەسپاند.

– کەواتا هەورەکەی توندە و خەونەکە بەدی دێ. نەزان و نەفام بڕوا ناکەن، کاتێکیش پەژیوان دەبنەوە کار لە کار ترازاوە.

نوێژەکەی سبەینێی کرد و سەرلەنوێ پێخەو و نوێنەکانی بەخۆیەوە، تا دنیا ڕوون بووەوە، ڕۆژهەلات، هەور چنگ لەسەرشان، دەتگوت دەودەوانێ دەکەن یەکدییان ڕاو دەنا.

شەرمین لە دەرەوە بەدەنگ هات:

– ئێمە ئامادەین باوە، چ دەڵێی.

جوامێر لە نێو جێگاکەی وەدەر هات. دوو جاری کچەکەی ماچ کرد، بەدەگمەن وای دەکرد، شەرمین زانی باوکە لە بارێکی زۆر نالەبار و سەختدایە و نابێ چەندوچوونی لەگەڵدا بکا.

زۆری پێ نەچوو جوامێر هەموو شتێکی ئامادە و تەیار کرد. جۆرکە هەرزنەکە و توورەکەیێ پیاز و هێندێ وردەواڵەی تری لە تێرێکی زبر کرد و بەسەر پشتی هێسترەکەیدا دابەست، نەبادا لە هەڵەت و ڕکە بەسەرکەوتندا لەسەر پشتی بخلیسکێ. نوێن و پێخەوی کچەکانیشی بەسەر پشتی مانگاکەدا دابەست. مانگای تاین پێی وابوو بۆ کێڵگەی دەبەن، داپەڕی. ژنە دەردەدارەکە پێی لە بەڕەی توان و تاوی خۆی پتر درێژکرد، لە زنجەکە هاتە دەرێ، باوەشی بەکچەکانیدا کرد، دایە کۆڕی گریان.

جوامێر بەنەرمییەوە سەرکوتی کرد:

– ئەمە بەفاڵێکی خێر ناگەڕێ لە سەفەردا. من ئەمە بۆیە دەکەم لە با و بۆرانیان بپارێزم.

دوا وشەی بەگوێی شەرمیندا چرپاند:

– لە ئێستاوە ڕێ هەموارە، ئەگەر پەلەش نەکەن بەدوو سەعات دەگەنێ. ئامینە لە تۆ کەم بردەبارترە، ئەگەر شەکەت بوو سواری هێسترەکەی کە. هێستری چاکە. هێشتا بەگوڕە. هەوساری مانگایەکە بەرنەدەی، زۆری کەڵک لێ دەبینن، کۆن دۆیە، تا چەند مانگێکی تریش شیرێکی باشی دەبێ. بڕیارم داوە، هەر هێندە لە بۆرانەکە قوتار بین، ئەم مانگایە بەو خوشکە بێوەژنە پێشکێش کەم. شیرفرۆشی زێتری لێ هەڵدەکرێ، نانەوایی چیی وای لێ وەچەنگ نایێ. هەینێ ئەو خێزانە کلۆڵە چاتر بەڕێوە دەچن، گوزەرانیان خۆشتر دەبێ، ئەو دوو منداڵە جوانکیلانەیەش پاروویان نەختێ چەوراییی تێ دەگەڕێ. دەی خوا دەستی بەبن باڵتانەوە بێ. ڕێگەکە خۆشە، هێشتا ڕۆژگار

هەوەڵیەتی. هێسترەکەی پێش خست.

ئامینە بەسەرداخستن و مل لارکردنەوە، دای کێشا، دەتگوت گوناهێکی هێندە گەورەی کردووە پێی هەڵناگیرێ.

مانگاکە لە کن دەرکە بەشڵەژانێکەوە قوڕاندی، دەتگوت هەستی بەوە کردبوو، جارێکی تر ناگەڕێتەوە.

دەرفەتێکی بە ژنە دەردەدارەکە دا تێروپڕ بۆ خۆی بگریێ. دەبوو گریابا و کوڵ و کۆوانی دڵی هیچ نەبوا نەختێ سووک کرد با. کە فرمێسکەکانی سڕییەوە. دەستی خستە سەر شانی، گوتی:

– ئەوەتا ئاوها ماینەوە ئێستا.

– دوو بەدوو.

– چۆنمان دەست پێ کرد، ئاوها ژنە چاکەکەم.

– خۆ دڵت خۆشە جوامێر؟

– ئێکجار زۆر ئازیزەکەم. من ڕەنگە بتوانم تۆ لە بۆرانەکە ڕزگارکەم.

– بەڵام؟

– تۆش بڕوام پێ ناکەی، باوکم زۆری بەدنیادیدەییی خۆی گۆش کردووم.

دەیگوت: «هەر ساڵێ باران لە مێرگان باری، لە پێشان لەسەر کۆ و کۆساران نەباری، ئەو ساڵە زۆر بەسام دەبێ، بەتۆفان و بۆران دەبێ. هەور و هەلایش وەک چەم و ڕووباران فەند و فێڵ و گزی و فزیی خۆی هەیە، خۆ ڕەنگ نییە گەڕی لە گەڕی کەسێ بئاڵێنێ و بەعاردیدا دا، لە لافاو و سێلاونادرنی بەسامدا نۆرەیان لێ دەگرێ. کاتێکی نۆرە لەسەر چیابارینی هات، هەینێ بۆران دێ و وای بۆ ئەو کەسەی خۆی لەپارێز نەگرتبێ.

جا دەبینی، باوکم چەند لەسەر هەق بووە، کە ئەو هەموو سڕ و ڕازی لێزانی و لە دنیادیدەیییەی خۆی پێ سپاردووم.

هەرکە ئاسمان گرماندی بۆ سەر گردەکەت دەڕفێنم، ئەو گردی فێرگەکەی

ئامینەی لەسەرە. هەر بەکۆڵی کۆڵ ئاسایی دەتوانم بۆ ئەوێت بڕفێنم. ئەگەر نەتتوانی بڕۆی لە کۆڵت دەکەم. من ئەوەی پێویست بوو لەسەرم، کردم. زوو لە خەڵکی گوندم ڕاگەیاند، لە مێژە پێم گوتوون ئاوەڕۆی ناو ئاوایی پاک کەنەوە، پان و بەرینتری کەنەوە. کەس بەگوێی نەکردم.

– تەمبەڵی و نەکارەییە.

– دەزانم، خەڵکەکە زۆریان لە داو و دەستوور و ڕەوشت و ئاکاری باو و باپیران لە دەست داوە، بەڵام دەبێ ئەوە بزانن کە هەروەکو ئەفسانەکە و ڕاستیی ئەفسانەکەی بەزاند، هەروەکو ڕاستیی ڕێگەی ئازایەتی و چوونە بەرمەیدان و چاونەترسی بەدی هات، هەروەها ڕاستییەکەی تریش کە بەخەیاڵی پیرێکی زۆرهانی ڕوو بەرەو خەڵەفانیش دەزاندرا، بەدی دێ. لەو سەرچیایە بارانێ بباری، تا ئێستا نەباریبێ.

– تۆ بڵێی ئێستا نەبارێ. ئەو دوو کچەتیوەیش بەڕێوەن.

– نابارێ، تا دەگەنە بەرەژوورکەکانی شار.

جارجار هەوریش لەناو خۆیاندا دەکەونە پێشبڕکێ و یەکدی ڕاونان، کەچی لە چەند تنۆکە بارانێ بەولاوە چیی تریان لێ هەڵناکڕێ.

– ڕاست دەکەی، لە هەوردا شتی وا هەیە. باشە تۆ بەڕاستەوە مانگاکەت بەخوشکت بەخشی؟

– زۆر بەڕاستەوە. هەتیوەکانی زۆر کەساس، زۆر لەڕ و لاوازن، ئەوجارە کە سەرم دان، زۆرم بەزەیی پێدا هاتنەوە، زۆریان بۆ گریام. تۆ بڵێی شایستەی خۆراکێکی کە لە گوانی مانگایەک وەبەردێ و پێویستمان پێی نییە، نەبن. خوا دەکا لەم بۆرانە ڕزگار دەبین، هێسترەکە تۆڵەی هەموومان بۆ دەکاتەوە. خوا یار و یاوەر بێ مانگایەکی دیکەی لەو بەهێز و گورتر دەکڕم، مانگایەک دەکڕم، نەک وەک ئەو، گوێرەکەی مردارەوەبووی ببێ.

ژنە نەخۆشەکە هەردوو چاوی پڕبوون لە فرمێسک، گوتی:

– ئەمەگ، ئەو ئافرەتە بێوەژنە زۆری پێویست بەوەیە، وەفادار و بەئەمەگی

لەگـەڵدابن. لەوانەیە کـچـەکـان لای پـووریَ زۆرتر بمێننەوە. خـۆ ئەمـە بەش بەحاڵی ئەوەیان کە دەخوێنێ ناچارییە. لەم گوندانە فێرگەی ناوەندی نییە، ئامینە هەر دەبوو بچێ بۆ شار لەبەر خوێندنەکەی. لەو پوورە چاکەی بەولاوە کێی تری هەیە؟

– ئەی پاش ئەوە چیی تر؟ دە بڵێ، چیی تر؟

– چیی تر، ئامـینە خـوێندنی ناوەندی تەواو دەکـا و دەچێـتـە فـێـرگـەی مـامۆسـتایان، بـۆ خۆی لە پاشـان دەبێ بەفێرکار. کێ ناڵێ، نابێ بەفێرکاری گوند، ئـەو دەمی لە خۆشـمـانەوە نزیک دەبێ. ژنـە دڵی بەقسـەکانی جوامـێر داکەوت، تا دەمـە و ئێوارە بۆ خـۆی سرەوت و داسـراکا. هەرچی جوامێریش بوو هێلکەکانی خڕ کردەوە، مریشکەکانی خستە کولانەوە، بۆ سـەدەمین جار لە ئاسـمـان ڕامـا، بزانێ چ ئاڵوگـۆڕێکی لێ بەدیار کـەوتووە. تـەمـاشـا ئەو هەورانەی کـە هەر لە بەیانییـەوە یەکـتـریان ڕاودەنا و لە دەودەوانێـدا بوون هێمنتر بوونەتەوە و لەسەر خـۆیان دەڕۆن، تەنانەت کە وەشـتەکەیشی هێواش دەبێتەوە بەرەو لوتکەی کەژەکان هەڵدەکشێن.

جوامێر بەخەمبارییەکەوە سەری ڕاوەشاند و بۆڵاندی:

– دەبێ ئەمـشـەو وریابم. ئەمـشـەو سێـڵاو بەسـەر گـونددا نەدا، سـبـەینێ بەسـەریدا دەدا. خــۆی بۆ نوێژی ئێــوارە ئـامــادە کــرد، گــوێی بۆ بـانگ هەڵخستبوو، بچێ لە مزگەوت نوێژەکەی بکا.

بەوریاییـەکی زرنگانەوە تێبینیی چ پکا چاکە؟ بۆچی مـەلای مزگـەوتەکەیان لە کارەساتەکە بەئاگا نەهێنێ. هەر لەپاش نوێژی شێـوان دەبوو خـەونەکەی بەگوێی مەلادا چرپاندبا.

مەلا بەقسـەی جوامێری نەدەکرد، گوندەکـەی بەو خەڵکە چۆڵ نـەدەکرد، ئەو خەڵکەی بەسـەر ئەو گردەی فێرگەکەی لێ بوو سەر نەدەخست. هەروەک جاری دی بەرپەرچی دەدایەوە و بەئایەتێ قورئان تفی لە زاریدا هیشک دەکرد.

«وینزل الغیث ویعلم مافي الارحام» خـوا هەر بۆ خـۆی دەزانێ کـەی باران

دەبارێنێ و چی لە پزداندا هەیە.

کەواتە چاتر ئەوەیە هەر قسەی لێ نەکا و بۆ نوێژی جەماعەتیش نەچێ چاکە. ژنە نەخۆشەکەیش ئەم ئێوارەیە بەتەنیا بێڵێتەوە. ئێوارە نزیک بووبووەوە، زۆر گرژ و مۆن بوو، ڕەشەبایەکی قایمی دەهات، زنجەکەی هێنابووە زەلالەت. ژنە هاواری کرد.

– بارانە جوامێر؟

– هێشتا نە، بەڵام ئەم جارە لەو کەژە دەبارێ.

– دەبینی؟

– تۆ بڵێی گەیشتبێتنە ماڵی پووڕێ.

– ئەی چۆن، دەمێکە گەیشتوون، ئەوان ئێستا خەریکی قسەی خۆش خۆشن و ئێمەیش تووشی ئەم شەوە تووشەی زستان بووین.

پووڕێ زۆری دڵ بەمانگاکە خۆش بوو. بۆ خۆی لە چاوخانی دارسووتەنییەکدا نووست. خواخوای ئەوەی بوو نەختێ بحەسێتەوە، دوو سەعاتە ڕێی بەبار و بەستەیەکی قورس و گرانەوە بڕیبوو، کەی ئەمەی دیتبوو. هێسترەکەیش لەولاوە بۆ خۆی هەڵاژا. یەکێ لە منداڵەکان گوتی:

– سارە شیرێکی خۆش دەخۆین. پوورە شەرمین گوانی مانگاکە ئەوەندەی شیر تێدایە بەشی هەموومان بکا؟

شەرمین دەستێکی بەشانی پوورزاکەیدا هێنا و هەستا، نەختێ لە ئاگردانەکە دوورکەوتەوە، گوتی:

– لێشمان دەمێنێتەوە و دەشی فرۆشین. تۆیش لە شیر فرۆشتندا یاریدەی دایکت دەدەی، تۆ بەسەر مالانیدا دەبەشییەوە. جا شیرێکی چەند چەور و بەتامی هەیە. بەدرێژاییی وەرز شیر دەدا.

پووڕێ گوتی:

– شیری مانگاکە بفرۆشین؟

ئامینە لێفە کزربووەکەی، کە بەر بارانی ڕێگە کەوتبوو، لە خۆیەوە پێچابوو، بزەیەکی هاتێ، گوتی:

– ئەی چۆن پووری، بەڵێ شــیــرەکــەی دەفــرۆشین. گــوانــی پڕە لە شــیــر، شیرێکی زۆریش، بۆ هەمووتانە.

یەکێ لە منداڵەکان قریواندی:

– بۆ ئێمە؟

شەرمین گەڕایەوە بۆ کن ئاگردانەکە، گوتی:

– ئەی چۆن، ئـەمـە دەبێ بە هـی ئێـوە. کــە دەگــەڕێینـەوە، لەگـەڵ خـۆمــانـی نابەینەوە، ئەمە دیاری مامتانە.

قـەیرێ کشـومـاتی و واق وڕمـان دەم و چاوی هـەمـووانی داگرت، چونکە ئەو خەبەرە کوتوپڕەیان قەت چاوەنۆڕ نەبوو.

شـەرمین تێ هـەڵچووەوە، کە چۆنی گوت وایە:

– بەخێـوکردنی مـانگایەکـە کارێکی زۆر سـانـایە، مـادامێکی ئەحـمـەد، بۆ فێرگە نـەچێ، دەتوانێ هـەمـوو ڕۆژێ بەگوان بەتاڵی بۆ لەوەڕێی ببـا و ئێواری بەگوانی پڕ. بیهێنێتەوە.

منداڵەکە قریواندی:

– ئای کــە خــۆشــە، ڕســتـێکی قـایشی بەکــووژەکــە و زەنگوڵەیەکی لـەمل دەکەین، هـەوسـارێکی گورزەهۆنیشی تێوە دەبەستین.

شـەرمین کە زانیی کوڕە کارەکەی بەدڵە و خۆی لێ نابوێرێ، گوتی:

– کەواتا مەسـەلەی بەخێوکردنی مانگایەکە بڕایەوە.

منداڵەکەی تریان کە هیچ دەنگی نەدەکرد، هەڵی دایێ، گوتی:

– ئەم مانگایە ناوی چییە پوورە شەرمین؟

– ناوی؟ ناوی نییـە خـالید گیـان. ئەمـە مـانگایە. هەر مـانگای پێ دەڵێن و چیتر. مەسـەلا، مـامت دەڵێ، مـانگایەکـە هەوسـارەکـەی لەسـەر دامـاڵە، ئەرێ

مانگایەکەتان دۆشی؟ ئەرێ ئەمڕۆ مانگایەکە چۆن...؟ ئیدی ناوی هەر ئاوها بوو.

– نەخێر.

ئەحمەد کە بڕیار وابوو ئەرکی گاوانیی مانگایەکە لە ئەستۆ گرێ، گوتی:

– نەخێر، دەبێ ناوێکی زۆر جوانی هەبێ. ئێمە تەنانەت مریشکەکانیشمان ناویان هەیە.

شەرمین دەڵێی چی، ناوی بنێین چاوتێر.

– چاوتێر؟

ئامینە بە لەبزێکی بەبڕیارەوە گوتی، «با ناوی وابێ، با وەک خۆت پێت خۆشە ناوی چاوتێر بێ. مادام تۆ دەیلەوەڕێنی با ناوی وا بێ.

دایکی گوتی:

– ئەحمەد وا پێت دەڵێم ها، بەرەڵڵای ناو مەزرا و خەلە و دەغڵ و دانی خەڵکی کەی ها، لە پاشان خاوەن مەزرا خراپت بەسەر دێنن.

– هەر لە سبەینێوە،

شەرمین گوتی:

– لە سبەینێوە مانگاکە بەپێش خۆت دەدەی.

ئامینە هەڵی دایێ:

– ئەو مانگایەی ناوی چاوتێرە.

ئیدی پووری دەستی بەهەواڵ پرسین کرد، لەوانی لە گوند بەجێمان. «ئەی بۆچی ئەوانیش نەهاتن؟ باشە، کاکم ئەم ساڵ تووتن چەند دەچێنێ؟ بەداخەوە، پارەکە، هیچی بەدەست نەکەوت. تووتنەکەی هەموو لەناوچوو.» ئنجا پاش ئەوەی دووجار و سێ جاری لە هەموو شتێ پرسی، بەری بەلای مانگاکەوە کرد، گوتی:

– ئێ شەرمین، گوتت، گوێرەکەکە زۆر جوان و ژیکەلە بوو، ڕەشێکی بەڵەک

بوو، خاڵ خاڵی سپیی تێدا بوو. لەسەر پێش وەستا؟

– هەر هێندەی یەک دووجار چاو بترووکێنی ڕاوەستا، دوایی بەلادا هات و کەوت، ئیتر هەڵنەستایەوە. منیش هەر بۆ سبەینێ، بردم لە دوور لەژێر گڵم نا. بەلای شوومییەکەی لەگەڵ خۆی بردە گڵەوە.

– چاکت کرد. لە نزیکەوەت شاردبایەوە، لەوانەبوو بەدوومییەکەی بەردەرکەی ماڵێی بەرنەدابای.

لەپڕ ئاسمان دەستی بەگرم و هۆڕ کرد، شریخەی هەورە تریشقە و برووسکە هەر ئەوەبوو دنیای ژێر و ژوور نەدەکرد، برووسکە لەناو ژوورەکەدا شەوقی دایەوە، دەم و چاوی منداڵەکان بۆ چەند ترووسکەیێ ڕوون بوونەوە.

– وا باران دەستی پێ کرد.

– جارێ وردە وردە دەبارێ پوورێ.

– وردە وردە، لە ڕەهێڵە و شەستەباران چاترە بۆ دەغڵ و دان، شەرمین.

– دەزانم، باوکیشم وای دەگوت. دەیگوت شەستەباران و ڕەهێڵە دەبێ بەسێلاو و دەڕوا، هەرچی وردە باران و لەسەرەخۆیە، زەوی و زار بەرەبەرە هەڵی دەمژێ و پێی دەبووژێتەوە.

ماڵی پوورێ دوو چاوە خانووی ڕوختەی مەحکەمی تێدابوون. هەریەکە کاریتەیەکی ئەستووریان بەناوەندا ڕایەڵ کردبوو. ئەنجا بەدەستەکی ئەستوور ئەستوور سەریان دارەڕا کردبوو. پەردووێکی چڕیشیان بەسەر دەستەکەکاندا ڕاخستبوو. مێردە دڵ و دەروون چاکەکەی لەگەڵ دوو دۆستیدا هاوینێکی دوور و درێژی لەگەڵدا خەریک بوون ئینجا لە دروستکردنی بوونەوە. پوورێ منداڵی دووەمی لەم خانووەدا بوو. ئیتر لەپاش ئەمە چیی تر نەبوو. چونکە باوکە تێدا چووبوو و بڕابووەوە. دەیزانی لاشەکەی جارێکی تر ناگەڕێتەوە، بەتەمای نەبوو.

– گوێت لێ بوو شەرمین؟

– بەڵێ پوورێ وردە باران بوو بەکڵاو بەسەرە و شەست و ڕەهێڵە.

– من لە شـەست و ڕەهێڵـە ترسم نیـیـە، ئاوەڕۆی ماڵـەکەمـان دەڕژێتـە ناو شارەوە، شوێنەکەشمان بەرزە.

شەرمین هەر ئەوەبوو شاگەشگەی نەیەتێ، گوتی:

– گوایە لافاوی باران هەموو بەیەک ئاوەڕۆدا دەڕوا؟

– نانا، هەر گەڕەکەی، ئاوەڕۆی خۆی هەیە.

– باشە، هەموو ساڵێ پێش تەڕوتووشیی زستان ئاوەڕۆکان دەردەدەن؟

– ئەی چۆن، هەموو ساڵێ کرێکارانی شارەوانی پاکیان دەکەنەوە.

– ئێمـەش لە ئاوایی ئاوەڕۆیەکمان هەیە، جاران قووڵ و بەرین بوو. هەرچی سێڵاوی ئەو کەژ و کێوە هەیە، بەوێدا دەچووە ناو شیـوەکەوە، بەڵام ئێستا پڕبووەتەوە. بەشی ئەو هەموو سێڵاوە ناکا.

– بەشی ناکا؟ چۆن شەرمین؟

– چەند ساڵێ دەبێ وازیان لێ هێناوە، نەدەری دەدەن، نەجۆماڵێکی دەکەن. لە زۆر شوێنەوە کەلێنی تێ کەوتووە و داڕووخاوە، زۆر جێی مەترسییە. باوکم داوای لە خەڵکەکە کرد، دەستێکی پێدا بهێنن، نەختێ مشووری بخۆن، جۆماڵێکی بکەن، پاکی بکەنەوە. دەتگوت لافاوی ئەم ساڵ لە کێش و توان بەدەر دەبێ.

– کەس بەگوێی نەکرد.

– گاڵتەشیان بەقسەکانیدا هات. هەر لەبەر ئەوەیش، پووریێ باوکم ئێمەی بۆ کن تۆ نارد، حەوتوویەک، دە ڕۆژێ لێرە بمێنینەوە. پووریێ، باوکم خەونێکی زۆر ناخۆشیشی دیتبوو. لە خەونیدا لافاوێکی بێ شومار لە پشت کەژەکەوە هەڵدەستێ، ئاوەڕۆی ئاوایی نایگرێ و...

– خەون؟ ئەوە باوکیشی هەروا بوو. دەیگوت پیاو هەروا لە خۆڕا خەون دەبینێ، کە منداڵ بووم، لەسەر ڕانی خۆی دادەنام، دەستی لە قژم دەخست، دەیگوت:

– خوا بەخێری بگێڕێ. ئەم شەو لە خەونمدا ئەمەم دیت و ئەوەم دیت.

خەونێکی دوور و درێژی بۆ گێڕاینەوە و لە پاشان هەر خۆیشی خەونەکەی بۆ لێک دەداینەوە. جوامێر هەر کە گوێی لێ دەبوو، دەستی لە هەموو شتێ هەڵدەگرت، گوێی بۆ هەڵدەخست. بزانێ ئەو خەونە چیی بەدوادا دێ. باپیرتان پیاوێکی ژیر بوو. لە وەرزێری دەڵێی لە خۆی لێزانتر نەبوو، لە نێچیروانی دەڵێی کەس دەسکی لە دوو نە دەکرد. ئەرێ تا ئێستایش تفەنگەکەی هەر ماوە، شەرمین؟

– ئێمەی لێ ترازێ لە هەموو شتێکی لا خۆشەویستترە. پایزی ڕابردوو کەڵەکێوییەکی پێ کوشت. جا، قەڵەو و گۆشتن بوو. هەر لەوێ کەوڵی کردبوو و بەکەوڵکراوی هێنایەوە بۆ ماڵ، ئێمەش جوان جوان کەرت کەرتمان کرد و بۆ زستانمان هیشک کردەوە. ئیتر لەوە بەولاوە هیچی تری ڕاو نەدەکرد. دەیگوت نێچیری گەورەیش وا لەو لووتکانە خۆیان حەشار داوە.

پوورێ بەهەراسانییەوە گوتی:

– هێشتا خێوەکەی لە گۆڕ دەهاتە دەر و ئەو کەژ و کێوەی دەخستە ترس و سامەوە لە بیر خەڵک نەچووەتەوە؟

– با بۆتی بگێڕمەوە پوورێ، لە تاو پێکەنین خۆت بۆ ڕاناگیرێ. خێوەکە باری کرد. باوکم خۆت دەیناسی چەند ئازایە، بەسەر چیا کەوتن، ورچێکی زلیان کوشت. تومەز ئەو خێوەی خەڵکەکەی تۆقاند بوو، ئەم ورچە بوو، نەخێو و نەهیچ.

– هێشتا نەء هێندێ کەس هێشتا هەر بەترس و سامەوە دەژی. برێ ڕاوکەر بەسەر چیا کەوتن، گوتیان مێچکەکەی لە هەرچی دڕندەی ئەو چیایە هەیە دڕتر بوو، هەروا گەڕانەوە. جا تا ئەم ئەفسانە بەکلک و گوێیە لە بیر خەڵک دەچێتەوە زۆری دەوێ.

پوورێ هەستا منداڵە بۆ خەو کەشەنگەکانی لەسەر جێگەی خۆیان نواند و بەلێفە و جاجم دای پۆشین. ئیتر سووتەنیی تری بەدەم ئاگرەکەوە نەدا. شەرمینیش پرسیارێکی لێ کرد، هەرچەندی کرد نەیزانی چۆنی وەڵام بداتەوە.

هەر ئەوشەوە ئاوایی خەوی لێ کەوت. ئاسمان هەور و هەلایەکی ئەوتۆی نەبوو. گەواڵە گەواڵە، لە هەوری پایز دەچوو. بەڵام جوامێر خەوی لە چاو نەکەوت. لەناو جێگە هاتەدەر، بۆ چوارەم جار، سونەتی دوای نوێژی دابەست، لە خوا پاڕایەوە، بەدڵۆڤانیی خۆی بەزەی بەموسڵمانانندا بێتەوە و ئاوایی لە تۆف و بۆران بەدوورخا. وەیشوومە و فەرتەنەکە بێ وەی و گەزەن ببڕێتەوە. بەڵام پاڕانەوە و لالانەوە هیچی لێ شین نەبوو، نەختێ بەر لە تاریک و لێڵە ڕووی ئاسمان ڕەش و تاڵ هەڵگەڕا. شەستەبارانێ بەوەشتەوە دای کرد، کەی کەم ئێستەکەم.

– ئاخرییەکەی بەدی هات، خەونەکەیە. ئافرەت بەخەبەری؟

– پشوویەک خەو لە چاوم نەکەوت.

– کەواتە لافاوەکە دێ. ئاوەڕۆکە نایگرێ، ئاوایی بەوردودرشتەوە وەک ئاومالّک ڕادەماڵێ. بارانەکە ترووکەیێ لێی کردبایەوە، خۆمان دەگەیاندە سەر گردەکەی قوتابخانە، وەنەبێ نزیکیش بێ. دەبوو زووتر بەخۆکەوتباین.

– چۆن، کار لە کار ترازاوە؟

– وا پێ دەچێ.

– هەر هیچ هیچ، چارەسەرێ، بۆرە ئومێدێ.

– لە خەونەکەدا ئاکامی گوندەکە زۆر گورچووبڕ بوو.

– جا تۆ بڵێی وا بقەومێ؟

– خوا وای کردووە.

– خۆ هەر هیچ نەبێ نیوەی خێزانەکە ڕزگاریان دەبێ، هەر باشە. جارێ خۆ ئەوە هەردوو کیژەکە وا لای پووریانن، لە وەی بەدوورن، شوکرانەبژێریی دەوێ.

– دەمزانی چ دەقەومێ. باوکم فێری ئەوەی کردبووم خەون چۆن لێک دەدرێتەوە و چۆن بەدی دێ. هێشتا لە قسەکەی نەبووبووەوە، لەناکاو بوو بە هات و هاوار و هیزە فریاکەون هیزە بمانگەنێ، لافاوە. خەڵکی نووستوو،

لافاو، لە هەموو لایەک بوو بەهەرا و زریک و هۆڕ، لافاو گاشەبەردی زەلام زەلامی قەد پاڵی کەژەکەی بەرەو ناو ئاوەڕۆی دەرنەدراو ڕامالی. زاق و زرووقی منداڵ و ساوا و وردە وردە لە نێو جەنگەی سێلاوی هار و شێت کە دوو مانگ بوو، بەبردەبارییەوە خۆی ڕاگرتبوو، هەرچییەکی وەپێشێ هات، هەر کەسێکی بەرکەوت، کوتومت جوامێر چۆنی لە خەونیدا دیتبوو، ئا بەو ڕەنگە شەپۆڵەکانی هەریەکە هێندەی بەژنە زەلامێ بلێند دەبووەوە. هەر دەتگوت لە دەریایەکی هاروشێتەوە هاتبوو، شەپۆلی وای دەدا، پیاو چۆن چۆلەکەیەک بەسەر دەستییەوە دەگرێ، ئەویش گایەکی بەسەرەوە با، هەر هێندە دیار دەبوو.

زۆریشی درێژەکێشا. تاریکایی تا دەهات تاڵتر و خەست و خۆڵتر دەبوو. باران بەئامان و زەمان لێی نەدەکردەوە. شەستەڕەهێڵە، تا دەمەدەمی تاریک و لێڵە بێ وچان، هەر لێی نەدەکردەوە. لەناکاو وەک یەکێ لە پلووسک و کوندەی سەربەرەخواری ڕاخوڕیبێ بوەستن، بارانەکە وەستا.

شیوەکە هێشتا لە گەرمەی هاژەدا بوو و هەرچییەکی، لە ئینسان و ئاژەڵ و شەمەک و بزگوڕی هەژارانە بۆ دەهات هەڵی دەلووشین و بەپرتاو وەک تێسکەی تفەنگ دەردەپەڕی و ئینجا لەبەردەم کوندرێکدا پێچێکی دەدایەوە، هاژەکەی نەختێ خاو دەبووەوە.

ڕۆژگار بەسەر دیمەنی کارەساتێکدا لە ئاوایی هەڵات، لەگێڕانەوە نایە.

باوبۆران و لافاوی بەلووزەو هیچ شتێکی زیندووی بەسەر پێوە نەهێشتبوو. دەرودیواری بەگڵ و بەرد هەڵچنراو بەجارێ تلیسابووەوە و بەسەریەکدا ڕووخابوون. خانووبەرە بەسەریەکدا داتەپیبوون و هەرچییەکیان تێدابوو سێلاو ڕای ماڵیبوون.

کارەساتەکە، کاتێ بەدیار کەوت، دەستەی بەدەنگەوە هاتن لە شارەوە هاتن، گەیشتنە ئەوێ. بەڵام لە پاش چی، هیچی ئەوتۆ نەمابوو ڕزگار کرێ. شیوەکە وردە سێلاوی دەوروبەر و پێچ و پەنای هەڵدەلووشی و خەریک بوو

هاژە و خوڕەکەی دەیدایە کزی.

پووریێ بەسەر پشتی هێسترەکەوە بوو، هێستری تاین بەگوێی شۆڕ و چاوی سیسەوە ڕاوەستا، شەرمین باوەشی بەپووریدا کرد، دایە پڕمەی گریان.

– ئە لێرەدا بووین پووریێ.

– کەواتا هەر ئەوەندەی لێ ماوەتەوە.

– هیچ نەما پووریێ. ئاوایی سەرانسەر تێدا چوو. باوکم بەمەی دەزانی، دەیگوت، هێندێ جار خەون بەڕاست دەگەڕێ.

پووریێ لەسەر پشتی هێستره بێ چارەکە دابەزی، بەرەو شوێنەواری زنجەکان چوو. هیچی وای لێ بەجێ نەمابوو. لە هێندێ بەرد و کەستەکڵ و قوڕ بەولاوە چیی دیت لە ئاسەواری زنجەکانی پێش نیوە شەوێ نەدەدیت.

شەرمین سەروپۆتەڵاکی لە هەشی باوانوێرانی هەڵێنابوو، دابوویە شین و شەپۆڕ. دەستەی بەدەنگەوەهاتن خۆی بۆ گەڕانەوە ئامادە دەکرد. هەرچی خەڵکی گوندەکانی تری دەوروبەر بوون کە بەر لافاوەکە نەکەوتبوون لەسەر ترۆپکی ڕەوەزەکان ئاڵقەیان بەستبوو، باسی کۆستە گەورەکەیان دەکرد.

– تازە ئیتر بەتەمای چی بین لێرە شەرمین، لە گەڕانەوە بەولاوە چیی ترمان لە پێشە. خۆ ئەوەتا بۆ خۆت دەبینی دەستەی فریاڕەس هاتووەتە سەر ئەوە کە هیچ نییە و نەماوە قوتار کرێ.

٤

شەرمین لە ماڵی پووری باوەشی بەخوشکەکەیدا کرد، تێروپڕ گریان. هەردوو منداڵەکەیش کڕوکپ واقیان وڕمابوو. پووریٚ هێسترەکەی بەرەو پشتیرەکە برد.

ئاسمان ساماڵ و لێک و لووس بوو، بەڵام لە ناکاو وەشتێکی ساردی بیٚ سەروبەر هەڵی کرد. لەوە دەچوو شەویٚ بیکا بەهەور و هەڵا.

پووریٚ گوتی:

– بەسە گریان، گریان چی لیٚ شین دەبیٚ. هەر هێندەیان لە دنیا بەش بۆ بڕاوبووەوە. مردوو کە لە دنیا کۆچی کرد، دەست لە هەموو شتیٚ هەڵدەگریٚ، زیندوویش دەبیٚ خۆی کۆ کاتەوە. ئیتر ئاوها.

شەرمین پیٚ و پلی قوڕاوی بووبوون، شوشتنی. دوایی چووە ژوورەوە، لە کن ئاگردانەکە هەڵکورما. دەیویست لەبەر ئەوەندە ئاگرەی دامرکابووەوە، خۆی گەرم کاتەوە، ئامینەیشی بەدوادا هاتە ژووریٚ، هەروا لەبەر خۆیەوە دڵی کوڵی دەدا و دەگریا.

ئنجا پووریٚ هات، لاقە تەڕەکانی هیشک کردەوە و کراسێکی وشکی لەبەرکرد.

شەویٚ، کە تاریک داهات، کاتی ئەوە هات نەخشە بۆ ژیانێکی نویٚ بکێشیٚ و پەردە بەسەر ئەو ڕابردووە تاڵە پڕ مەینەتییە کوتوپڕەدا بداتەوە.

– شەرمین، مادامێکی تۆ لەسەر ئەوە سووری، ئامینە دەبیٚ خوێندنەکەی تەواو بکا و ببیٚ بەفێرکار. دەبیٚ شاقەلی هاریکاریم لەگەڵدا هەڵکەی، ئێمە دەتوانین کارەکە جێبەجیٚ بکەین، یارمەتی و هاریکاریی دەویٚ.

– ئەمە خواست و ئارەزووی باوکمە پووریٚ. ئەمەی لە ستۆی من خستووە.

خواست و ئارەزووەکەی بەجێ دێنین، هێسترەکەمان هیچ پێویست نییە، دەیفرۆشین، پارەکەی بۆ ئامینە دادەنێین، لەبەرەوە، وردە وردە، خوێندنەکەی پێ بەسەرببا، من و تۆش پێکەوە دەست بەنانەوایی دەکەین، نان دەفرۆشین. شیری مانگایەکەیش چەندی لێمان زیادبوو دەیفرۆشین.

ئامینە بەدەم فرمێسک سڕینەوە، هەڵی دایێ:

– جا ئەگەر وایە، خۆ تۆ ئەوەندەی تر بارت گران دەبێ پوورێ. بۆ بەپارەی هێسترەکە مانگایەکی تر نەکڕین، مانگایەکی کەم بەناو ساڵداچووتر، بەشکو گوێرەکەی ساغ بێنێ و لەباری نەچێ.

شەرمین دڵی بەم پێشنیهادە خۆش بوو، گوتی:

– ئای کە چەند شتی چاکە، پارەی هێسترەکە مانگایەکی تری بەشیری پێ دەکڕین.

پوورێ هەڵی دایە:

– کەواتا، سبەینێ چەندی پارە کرد، دەچم بۆ گوندی حەسەناوا، کوێخایەکەی، لالۆ قادر پیاوێکی زۆر چاکە، باوکی منداڵەکانمی زۆر خۆش دەویست، پارەکەی دەدەمێ مانگایەکی بەگوێرەی دڵی خۆیمان بۆ بکڕێ.

ئەحمەد قریواندی:

– دوو مانگا، شیری زۆر. ئەی ئاڵفی لە کوێ بۆ پەیدا دەکەین؟ خۆ بەڕۆژی باران و تەڕوتووشی ناتوانین بۆ لەوەڕیان ببەین.

– ئێ دیارە دەبێ ئاڵفی بۆ بکڕین. دەبێ بۆ ڕۆژی تەڕوتووشی ئاڵفی بۆ دەبارکەین.

– کەواتا بەباران و تەڕوتووشی پێوەیان ماندوو نابین.

شەرمین گوتی:

– مانگاکان شیری چاکیان دەبێ. لە پارەی ئاڵف کڕینیش زیاد دەبێ، لەپاشان ئێمە،

پووریّ بەخۆشی خۆشییەوە، قریواندی:

– ئەی ڕیخ و تەپاڵەکەی، ئەویش بۆ تەندوور داخستن و، خوا تا دەروویەکت لێ نەکاتەوە دەروویەکت لێ داناخا. بەندەی چاکی خۆی لە بیر ناکا.

هەر لە سبەینێوە ژووری دووەم دەبێ بە هی خوشکەکەت شەرمین گیان. وەختی خۆی هی من و ڕەحمەتی هاپۆتان بوو.

لەو ڕۆژەوە، لەکن منداڵەکان دەخەوم، هەروەک خۆی چۆن، هەروا ماوەتەوە. چرایەکیشی تێدا بەسنگێکەوە هەڵواسراوە، پاک کرێتەوە، بەشەوقە بۆ کتێب خوێندنەوە و دەرز و دەور.

شەوگار داهات، کەس هیچی نەخواردبوو، خەم و پەژارە دیسان وەک پەڵە هەوری ڕەش سووکە بایەک بیانجمێنێ، کەڵەکەیان کرد.

هەموو لە خەو ڕاچوون، پووریّ دەبوو سبەینێ زوو بەخەبەر بێ، نان بکا بۆ فرۆشتن، بیر لە سەروکاری هێسترەکە بکاتەوە. سبەینێ کە ڕۆژهەڵات ئاسمان سامال و بێ گەرد بوو.

دنیا تینێکی ڕۆژی پێوە دیار بوو. جۆگەلەی نێو کووچە و کۆڵانان لیتاوی سەرلەبەر، بەرەو شێوە گەورەکان ڕادابوو. پووریّ نانی ئامادە کرد و بەمنداڵەکانیدا ناردی، لە کۆڵانەکانی نزیک خۆیان بەسەر مشتەرییانیدا ببەشنەوە. چێشتانێکی قایم، هێسترەکەی بەکورتان و تەنگ و بەرەیەوە بەپێش خۆی دا، بۆ مەیدانێ، پەیتا پەیتا لە خوا دەپاڕایەوە: سا بەشکو نرخێکی چاک بکا، مانگایەکی بەشیری، بەخواستی خۆی پێ بکڕێ.

خوا هەڵناگرێ، شەرمینیش چاکی مەردانەی لێ هەڵکرد، نێو ماڵی کۆکردەوە و نیسکێنەیەکی بەئاو و تاوی لێنا. لە یەکێ لە دراوسێیەکانی ماڵی پووری پاڕایەوە شایەتنامەی ڕاگوێزتنی ئامینەی خوشکی لە فێرگەی گوندەوە بۆ فێرگەی قەزا بۆ بێنێ.

لەگەڵ ڕۆژگار ڕاشکان و ئێوارەی تاریک و ساردا خێزانەکە بەدەم لەناوەختدا چاوەڕوانیی پڕ هەراسانییەوە ترس و سامیان لێ نیشتبوو، بەڵام

بەرەکـــەت دا. پووریّ بەمـــانگایەکی چاکی زلەوە گـــەڕایەوە و ترس و ســـام ڕەوییەوە. مـانگایەکە لەو مانگا ڕەسـەنانە بوو کە شیـری زۆر دەدەن. ڕەشێکی بەڵەک بوو.

سمەکانی قوڕاوی بوون. کلکی لە زەوی دەخشی.

شەرمین گوتی:

– ئەمەت لە کویّ هێنا پووریّ؟

– ئێستـا پێتـان دەڵێم، دە تۆ بۆ سـەر ئاخـوڕەکەی ڕادە، دەبێ نـەختێکی تر بیدۆشـین، شـەوێش جلێکی بەسەر پشتدا دەین. مانگاکان هیـچ ناکۆکییەکیان لێ نەقـەومـا. بۆ شـەویّ، پاش ئەوەی شـۆربا نیسکەکە گەرم کرایەوە و نەختێ خــەست و خــۆڵیی تێ گــەڕا و خــورا، پووریّ دەســتی بەگـێـڕانەوەی باسی مانگایەکە کرد:

– هەرکە گەیشتـە گوند و نەگەیشـتم یەکڕاست چووم بۆ مـاڵی کوێخـا قادر، هەر ئەوەندەم خۆش بوو کارەسـاتەکەم بۆ گێڕایەوە، بەڵێ خۆیشـی بیستبووی، دایە یەک کارەڕات و گریانێ ئەوسـەری دیار نەبوو.

گوتی:

– مـــێـــردیشت چوو، برایشـت چوو، خـــوا ســــەبووریت بەو دوو منداڵە خۆشەویستانەدا بداتەوە.

چیتـان لێ بشـارمـەوە، هەر کە پارەکەم لە مـستی نا، مـانگایـەکم بۆ بکڕێ ڕاست و ڕەوان پارەکەی بۆ گێڕامەوە، گوتی:

– ئەمـە بۆ ئەو منداڵە سێوییـانە دانێ. من مـانگایەکتـان لە مـانگاکانی خـۆم پێشکێش دەکـەم، لە هـەموویان چاتر بێ. من گوێلکەکەیم بەسـە، پاش ساڵێکی تر وەک دایکی شیرێکی زۆر دەدا.

ئینجـا هـەسـتـا، ڕۆیی. دوای قـەیریّ مـانگاکـەی هێنـا، گوتی: «ئەمـە شـیـری زۆرە، مادامـێکی ئێوە شیـرەکەی دەفرۆشن، ئەمە چـاکە. بەڵام ئەوەندەم تکایە، کە بەهـار داهـات، با کـەڵ بگرێ، مـانگایەکی بزۆک و شـفـتـەژێیـە» خـۆ هـەر کـە

باسی مانگایەکەتانم بۆ گێڕایەوە، کە چۆن هەموو ساڵێ گوێرەکەی مردار بووەوەی دەبوو، نەختێ پێ کەنی، گوتی:

– گوناهـ، هەموو گوناهی ئەو نەبوو. بەشی زۆری گوناهەکە بەر ئەو کەڵەگایە دەکەوێ کە کەڵی لێ دەگرت و گوێرەکەی وای لە پشت نەدەکەوتەوە بەرگەی چەرمەسەرێی ژیان بگرێ. تۆ، کاتێکی بەهار هات هەرتکیانم بۆ بنێرە، جا ئەوسا دەبینی کەڵەگایەکانی من چۆن گوێرەکەی مرداربووەوەیان لێ ناکەونەوە.

ئەحمەد گوتی:

– ئای کە چەند مانگایەکی بەرزە. خۆ دەبێ هەر لە ئێستاوە خۆمی لەگەڵ ڕابێنم، نەکو سبەینێ پێوەی ماندووبم.

دایکی گوتی:

– نانا، مانگاکان دەبێ دوو حەوتوو لە پشتیردا بن، ئەوسا لەپاشان بۆ لەوەڕیان ببە.

هەموویان بڕیاریان دا ئەحمەد خۆی و براکەی تری بچن، ئاڵف و ئالیک بۆ مانگاکان دابین کەن. ئەوی بۆیان خڕ کرایەوە خڕی کەنەوە و ئەوەی بەکڕین بێ بۆیان بکڕن.

خێزانەکە، پڕ بەژوورەکان و بەدڵنیاییەوە، بۆ ئەوەی سبەینێ، سا، ژیان چۆنی هێنا ئاوا تێ هەڵچنەوە، لێی نووستن.

پوورێ:

– بۆچی شەرمین گیان، لە دەورت گەڕێم؟

– نامەوێ بیر لەمە بکەمەوە پوورێ گیان.

– جا بۆچی کچم، کوڕە هەموو کچێ بەئاواتیەوەیە. کوڕە کاربەدەستەکەت ڕەت کردەوە، بە بەقاڵە حاڵ و باڵ خۆشەکە قایل نەبووی، ئەمەی تریشیان کوڕی پیاوێکی خاوەن ملکی زۆرە و لە پیاوە بەنامێیەکانی ناو شارە.

– ئەگەر حەز دەکەی نێوان هەر خۆش بێ واز لەمە بێنە پوورێ.

– لەمە؟

– لە هەر خوازبێنییەک. من بڕیارم داوە، تاوەکو ئامینەی خوشکم نەبێ بەفێرکار شوو نەکەم.

– جا ئەو چەندی تری ماوە، ئەوا ئەمسالْ لە خوێندنی ناوەندی دەبێتەوە و دەچێتە فێرگەی فێرکاران بۆ خۆی. پێویستی بەچی هەیە؟ کە شووی کرد، حالْ و گوزەران بەرەو خۆشی دەچێ.

– ئەی ناکرێ بەعوزر هێنانەوەم دلْت داکەوێ پووری گیان؟

پووری قـــەیرێ مـــات بوو، لای وا بوو وەلاّمـــدانەوەی دلْم دەشکێنێ، شەرمینیش سۆسەی ئەوەی کرد.

– پووری ڕەنگە پێت وا بێ ناتەواوییەکم هەبێ.

– نا لە دەورت گەڕێم، من چۆن بیر لە شتی وا دەکەمەوە.

– پووری گیان، ڕەنگە خەلْک وا بیربکاتەوە، بەلاّم دلْنیابە شوکور هیچ ناتەواوییەکم نییە، منیش وەک هەر کچێکی لەم تەمەنەدا دەیگری، سپ و ساغ و ڕوختە و تەواوم.

هەرچی لە کچێنیم بەگومان کەوتنیشە ئەوە لە پڕوپووچ بەولاوە چیی تر نییە و جێی داخیشە، من خۆشم و ئامینەی خوشکیشم لەو وەرزێرە بەئاووڕووەین لافاو ڕای مالْی و کەس نەیزانی بەلەت و پەتکراوی لەو دۆلاّنە، لە کوێ گیرسایەوە.

– جا کێ گومانی لەوە کردووە شەرمین گیان. چەند ڕۆژێکە وەک بلْێی زۆر دلْت ناسک بووەتەوە.

– منیش فەرقم پێ کردووە، دەستت ماچ دەکەم. هەر بۆیەکەیش لە شیر و نان بەشینەوەت حەساندمەوە و ئەوەشت لە ستۆی خۆ گرت.

– بەلاّم تۆ کاری لەوە سەختتر دەکەی. مانگا دۆشین و نانکردن کارێکی سانا نییە. ماندوویێتی و ئەرکە گرانەکە هەموو لەوەدایە شەرمین گیان. دەبێ منەتبارت بم.

– چاکە پووریّ گیان. لاشت وا نەبیّ تەنیا هەر بیر لە ئامینە دەکەمەوە.

– ئەی لە کێی تریش؟

– لە وەرزێرەکانیش پووریّ، ئەحمەد و خالیدیش، ئای کە کوڕی چاکن.

– نێرینەن، نانی خۆیان لەسەر بەردی ڕەق دەردێنن، لێیان مەترسە ئەحمەدیان ئەوە بۆ خۆی لەگەڵ مانگا لەوەڕاندندا خەریک دەبیّ و هەرچی خالیدیشە ئەوە تۆ بۆ خۆت دەزانی، هەموو ڕۆژیّ لە نانی خۆی پتر پەیدا دەکا. بەئێواران خوێندنی خۆی دەخوێنیّ و بەڕۆژیش لە چاخانەکەی قادر ئاغا شاگردیی خۆی دەکا.

– ئێمە لادێیین شەرمین گیان، وەرزێر لەوەرزێری بەولاوە بیر لە چیی دی ناکاتەوە.

– ئای لەو خۆشییە، چوار دۆنمیان زەوی و زار هەیە. ڕاستە ئاوایی سەرلەبەر لافاوەکە ڕای ماڵییە ناو شیوەکەوە، بەڵام زەوی و زارەکە هێشتا هەر لە شوێن خۆی ماوە، باوکم ئەو ساڵە هەرچی بنەتۆوی چاکی هەبوو پێوەی کرد. ئەو ساڵە دەبیّ چاک هەڵی دابیّ، جا نازانم دوای ئەوسا، شین بووەتەوە یان نا؟ زەوی شۆ نەکریّ دەبیّ بەبوورە، زەوییە بنارە، ئای کە باوکم چەندی خۆ بەبژارکردنییەوە ماندوو کرد. با هەرچی تۆوی دار و درەخت و دەوەنی بیّ کەڵک هەیە، تێی داویّ. ئیتر هەرچۆنیّ بیّ.

پووریّ دانەوییەوە، دوو جاری شەرمین ماچ کرد، گوتی:

– کەواتا دوا ڕۆژی منداڵەکە ڕوون و ئەلدەیە.

– زەوییان هەیە...

– دۆنمێکی بۆ تووتن چاندن، هەڵدەقولیّ.

– ترس و سام نەما پووریّ.

– منداڵەکان گاجووتێک و هێسترێکیان دەویّ. بەڵام ئەو دوو...

– بەڕاستی مانگای چاکن. جا دەبینی کێڵگە تووتنە خنجیلانەکەمان چۆن دەبووژێتەوە.

– بەژنە گەنمە قەناری و ڕەشگوڵ و گەنمەشامیش لەسەر سێ دۆنمەکەی تر هێندەی بڵێی هەڵدەدا و ئەستوور دەبێ.

– تۆیش هۆ زەوییە بەیارەکە، شەرمین گیان، شوو دەکەی و منداڵی جوان جوانی وەک گوڵت دەبن. جا ئەوسا دەبینی ژیانی دایک و فرزەندی چەند خۆشە.

ئامینە لەولاوە بەلۆژە لۆژ هات:

– لەوە دەچێ دەمەتەقێیەکەتان زۆر خۆش بێ.

– ئێکجار زۆر...

زانیت پووریێ، خۆ دیسان دەستی بەڕووی ئەمیانیشەوە نا.

– نا نا ئامینە بڕواییم بەنیازی دڵی هێنا، ئیتر لەوە زیاتری زۆر لێ ناکەم. لەبەری گرانە. خۆ هەرچی بڵێم بێ سوودە.

ئامینە بەری بەلای شەرمینەوە کرد، بەدەنگێکی هەڕەشاوییەوە گوتی:

– ئەمە هەموو لەبەر من خۆت لەم خوازبێنیکەرانە بێ بەش دەکەی، جا کێ دەڵێ دوارۆژ مێردی وەک ئەمانەت دەست دەکەوێ. سا بەوەندە سوێند و قورحانە شوو بەمەی دواییان نەکەی، منیش دەست لە خوێندن هەڵدەگرم، شار بەجێ دێڵم، دەچم کارێ بۆ خۆم دەدۆزمەوە.

شەرمین لاشانی ئامینەی بەتووڕەییەکەوە ڕاتەکاند، گوتی:

– ئامینە، بۆ ئەوەندە کەودەن و هیچ و پووچی ئەگەر کار بەشار بەجێهێشتن بێ، من بۆی دەردەچم، ئەویش بێ پاڵپشت و پشتیوان و بێ ئەوەی کەس بناسم و سەرەودەرەیێ لە ژیان دەرکەم. خۆ ڕۆژێ لە لایەکەوە خولکێ بکرێم، جا ئەوسا دەبینی چۆن بۆی دوور دەکەومەوە و کەس بەسەروشوێنم نەزانێ. پووریێ هەڵی دایە:

– ئا ئەمەیان تەنیا شتێکە کە دەبێ دەسەلاتمی لێ بەکارخەم و بەری لێ بگرم، چۆن دەڕۆی و بۆ کوێ؟

ئەحمەد بەدەنگ هات:

– پووره شـەرمین تۆ برۆی منیش هەردوو مـانگاکـان دەکـوژم و ئەم دنیـایە بەجێ دێڵم، جا داخوا دەبم بە دز، بە پیاوکوژ...

پووریێ تووڕە بوو، گوتی:

– واز لە کێـشـە و هـەرای بێ تـام بێنە، ئیـتـر لەمـەوپاش، قـسـە قـسـەی من دەبێ و بڕایەوە. نەکــەس دەڕوا و نەهیچ بـێ ئاوەزێکیش حـەددی ئەوەی هـەیە بیر لەوە بکاتەوە، زیان بەمانگاکان بگەیێنێ.

یاڵڵا هەموو بۆ ژوورەوە. ئەم شەو زۆر سارد دەبێ، زۆر زۆر شـەرمین...

کەس بەرپەرچی پووریێی نەدایەوە، نەبەچاک نەبەخراپ. بێگومان هەق بەلای ئەوەوە بوو.

## ٥

پێش ئەوەی بگەیتە بەر دەرکەی بازاڕی گەورە، کە لە کۆڵانە تەنگەبەرەکەی بەرەو مەیدانەکە لات دەکردەوە ماڵی کازم عەباس بوو. ماڵی کازم عەباس لەچاو ماڵەکانی ئەو کۆڵانە لە هەمووان گەورەتر و ئاپۆرەتر و بەقرە و برە و هەرا و هۆریاتر بوو. بەم ڕۆژگارە سەعاتێ کپی و بێ قرەوبرەیی بەخۆیەوە نەدەدیت. کازم عەباس هەرسێ ژنەکەی بەیەکەوە لەو خانووەدا دەژیان. ژنەکانی هەریەکە لە تەمەنێکدا بوون. کەڵووڕانێ نەوە و نەویرەیان لێ کەوتبووەوە، هەریەکە بەلایەکدا پەرش و بڵاو بووبوونەوە. هەر خواخوای ئەوەیان بوو ڕۆژێ زووتر لەو ماڵە دوور کەوێتەوە. هەندێکیان ماڵەکەیان ناونابوو دۆزەخ، چونکە بۆ چاوترووکانێ شەڕ و شۆڕ و هەڵڵا و بگری لێ نەدەبڕا، جنێو و لێکتر هەڵدان و تیتک یەک لەبن دەرکێشان و دەستەوبەرۆک وەستان نەدەبڕایەوە. هەرچی سەرەک خێزان بوو لەم هەنگامە و هەرا و بگرەدا، وەک گوڵمێخی ئەستووری بەر ڕەشماڵی داتەپیو دەوەستا و ورتەی لەزاری دەرنەدەهات، هەرکە تووڕەش بوایە، ئەویش بەدەگمەن وا ڕێک دەکەوت، بەدەنگێکی کەرخ و لرخن، وەک لە قەمیشێکی پووکاوەوە دەرچێ، پڕ بەدنیا دەیهاڕاند، دەیگوت.

– بێ دەنگ بن، ڕەشەوڵاخینە بێ دەنگ. با دەوتان بەقوڕ نەئاخنم، کە بۆ هیچ دەست نادەن، کام شت لە بازاڕ تاسووق و خۆشە دەیخۆن و وەک هێستری ماچە قەڵەو دەبن.

بەسە ئیتر. چەند دەقیقەیەک بێ دەنگ دەبوون. ئەویش بووبوایە بەخاتوونی ماڵێی و بەوەوە بووبوونا بەچوار ژن، داخۆ بۆچی پێی قایل نەبوو و پشوویێک ڕادەما، بیری دەکردەوە. خۆشترین شتێ کە بیری لێ دەکردەوە ئەوەبوو کە شەرمین شووی پێ کردبا و گاڵتەی پێ دەکرد. ئەو لەحنەتییە لەخۆباییە خۆی

بەشۆخترین کچانی ئەم سەر زەوینە دەزانی. هەرچەند لە ڕێگەوبان تووشی دەهات، دەیگوت:

– هۆ مانگی چواردەی گەڕەک و هەموو دنیا، چۆنی؟

ئەویش وەڵامی دەدایەوە:

– لە تاریکیدام مام کازم.

– تاریکیی چی تۆ مانگی چواردەی.

– چونکە تۆ مانگ دەخەیە ناو هەور و هەڵاوە.

مام کازمیش دەیدایە پێکەنین و لە خۆشییان مەست دەبوو و لەشی خاو دەبووەوە یەکسەر دەچوو چێشتە خەوێکی بۆ دەکرد. حاڵ و باڵی خۆش دەبوو، دێیەکی بەزەوی و زاری هەبوو، بەشی ماڵ و ورگ دادڕاویی ئەو کەڵووارنەی دەکرد.

شەرمین بەپێکەنینەوە هاتە ژووری و هەر لەسەر پێکەنینەکەی ڕۆیی. پووری لە هەموو کاروباری بووبووەوە، کوانوویەکی لە هەیوانەکە قوت کردبووەوە، ئاوی خستبووە سەر ئاگر، پێ و پلی بەئاوی گەرم، پاک شوشت، گوتی:

– شەرمین ئەوە بە چی پێ دەکەنی؟ خۆ خواخوامە هەمیشە دەم بەپێکەنین و دڵخۆش بی. پیاو لەم ژیانە قورس و گرانەدا جار بەجار نەیداتە باری بێ عاری و پێکەنین و بێ باکی، هەر بەجارێ لێی دەبێتەوە مۆتەکە.

– بەهیچ پووری گیان، هیچ.

– بڕوا ناکەم. ئینسان لە هیچە پێکەنینی نایە.

– شتێکم بیرکەوتەوە، پێکەنیم.

– دیسانەوە کابرا نەبێ، پیرەمێردە سێ ژنەکەی کە جارجار، بەو چاوقایمییە بێ شەرمانەی خۆیەوە گەڕت لە گەڕ دەئاڵێنێ.

– کابرایەکی قۆشمە و گاڵتەچییە، بەڵێ ئەو بوو. دەیویست لە سەردەرانەی ماڵیان نزیک کەومەوە، گوایە، شتێکی خۆشم بەگوێدا دەچرپێنێ. شتێکی کە

گوایە خێری منی تێدایە. لە قسە بێ تامەکانی بەولاوە چیی تر بڵێ.

– هەر ئەوەیە بەخێرییەت ببی بەژنی چوارەمی.

– ئەی بەسزمان.

– بەهەموو هەراوبگر و شەڕەشەقێکییەوە، ژیانێکی خۆش و ئاسوودە دەژی.

– بەڕاهاتن بەرگەی شتی ئەوتۆ دەگرین پێمان وایە لەکێش و توان بەدەرە.

– بەڵێ شتی وا ڕوودەدا. وەرە ژوورێ. لە خاوێنکردنەوەی ژوورەکە بوومەوە.

ئێوارە داهات. ئێوارەیەکی زستان بوو. گەواڵە هەوری پاش بارانێکی دوو سەعاتی بەئاسمانەوە بوو. هەرچەند باران بەتاو باریبا، خەم و پەژارە دای دەگرت. پوورێیش، بەمەی دەزانی. مانگاکەی هەوەڵەمینیان وەک ئەویش، گوندە خنجیلانەکەی لافاو ڕای ماڵی بەبیربێتەوە، قۆڕاندی، خۆشبەختانە، ئەو لەوێ نەبوو.

کە دنیا تاریک داهات و خێزان هەموو لە دەوروبەری خڕبوونەوە گوێیان لە دەرکە لێدانێکی سووک بوو. لەپاشان کابرای چەتەوڵ بەلۆژەلۆژ هاتە ژوورێ، سڵاوی کرد.

– کەیوانۆ؟

پوورێ هەڵستایە سەرپێیان سڵاوەکەی ساندەوە. کابرا دراوسێیەکی کۆن بوو. کاتێکی مێردەکەی ئەم خانووەی بنیات نا، یارمەتییەکی کردبوو، قەتی لەبیر نەدەکرد.

– فەرموو، مام کازم، فەرموو بەرەژوور. ڕەشەبایەکە کپ بووەوە؟ کابرا پێڵاوەکانی داکەند. گۆرییە ڕەنگاوڕەنگەکانی بەدیار کەوت و پێی چەپی یەک دوو جار بەدەستی هەڵگڵۆفت و بەسستییەکەوە دانیشت و پشتی بەدیوارەکەوە دا. پوورێ پرِی دایە بالیفێکی پەڕاخن لە ژێر پشتی دانا.

شەرمین هەر لەودەمی چووە دەرەوە. کابرا بەدەنگ هات:

– ئەوە بۆ کوێ؟ من بۆ کارێکی گەورە هاتووم. جا بۆ ئەوەی هەڵنەیێی، باهەر لە ئێستاوە پێت بڵێم، کارەکە هیچ پێوەندییەکی بەخوازبێنی و شووکردنەوە نییە، تێ گەیشتی؟ دانیشە دانیشە، تۆ نەوەی منی؛ من هەر وەک هەموو دەزانن عەیبم ئەوەیە زۆر حەز لە گاڵتە و گەپ دەکەم.

پووریێ، بۆ ئەوەی ڕێی گلە و گازنی لێ بگرێ هەڵی دایێ:

– بەڵام تۆ بەگاڵتەت نەبوو.

مام کازم گوتی:

– ڕەنگە وابێ، بەڵام من پێم وا بوو ئەوەی خستمە ڕوو، کارێکی خێر لەگەڵ ئەو کیژە چاکەدا دەکەم.

پووریێ بەتەوسەوە:

– تۆ لە ماڵەوە خۆت لە جێی قازی داناوە، کەچی وەک بیستوومە، بەهەقیانەت داد ناپرسی.

مام کازم دەستی بەپێکەنین کرد. دەم و ددان کەل و کۆم بەدووکەڵی جگەرە ڕەش هەڵگەڕاوەکانی بەدیارکەوتن.

– دەڵێن قسە لە شوێن خۆیدا خۆشە. شەرمین ئەمە هەلێکە و هەڵکەوتووە. من بۆیە مەسەلەکە دەخەمە ڕوو، چونکە تۆ شایانی بەتەنگەوەهاتنی، بۆ ئەوە دەست نادەی وەک ئاوی مەند لەم شارە چکۆلەیەدا هەروا بمێنییەوە سەیری هەر بابایەک دەکەی بۆ خۆی ژن دێنێ و خاوخێزانی بەختەوەر پێکەوە دەنێ، کەچی تۆ ئەمە بەبەختەوەری نازانی.

پووریێ قۆرییە چاکەی لە ئاگرەکە نزیک خستەوە، گوتی:

– دە فەرموو بزانین چیت پێیە، هەموو گوێت لێ دەگرین.

– قاسمی کوڕم بۆ سەردانێکی چەند ڕۆژە لە بەغدا گەڕاوەتەوە. خۆ تۆ چاکی دەناسی. کوڕێکی لاوی لە سەرخۆیە. کوڕێکی خێرخوایە، خێزانێکی خنجیلانەی لە دەوروبەری ئەو شارە گەورەیە هەیە. کارێکی چاکیشی هەیە، بەئارەقەی نێوچاوانی خۆی دەستی کەوتووە.

– چاکە.

– پاش دوو ڕۆژی تر دەگەڕێتەوە. هەموو ساڵێ ئەم پیاوەتییەم لەگەڵدا دەکا. ئەم هەموو ڕێگەوبانە دوور و درێژە دەبڕێ، سەردانێکم دەکا.

– چاکە مام کازم، جا شەرمینت دەوێ؟

– نانا، بیرم لەوە نەکردووەتەوە. کوڕەکەم ژنەکەی خۆی زۆر بەدڵە، بەڵام پێم گوت کارێ بۆ شەرمین لە بەغدا بدۆزێتەوە، مادامێکی دەستی دەڕوا.

شەرمین لە خۆشییان پێی بەزەوی نەدەکەوت، پرسی:

– چی گوت؟

– لە زۆر شتی پرسی، دواییەکەی بەوە هێنایەوە کە چاکترین کار بۆ تۆ ئەوەیە ببی بەسستەر.

– جا چۆن، من چی لە سستەری دەگەم.

– دەزانم، بەڵام گوتی یەکێ لە دۆستەکانی کارگێڕی نەخۆشخانەیەکی گەورەیە و نیازیان وایە دەورەیەک بۆ سستەری بکەنەوە، بەڵام کۆسپ ئەوەیە، شەرمین شایەتنامەی خوێندن تەواوکردنی سەرەتاییی نییە، دەی گوێی مەدەیە، مادامێکی شایەتنامەی پۆلی پێنجەمی بەدەستەوە بێ، کارەکە هاسانە.

پووری پێیدا هەڵکالا:

– ڕۆژێ نەهاتی خێرێکت بەناوچەوانەوە بێ، دووعایەکی خێرت بۆ بکەین.

– دەزانم، جا منیش بۆیە ئەمڕۆ ئەم کارە خێرەم بۆ هێناون، ئەگەر برازاکەتت بەدڵ خۆش دەوێ، دەرووی خێر و بەختەوەریی لێ دامەخە. چ دەڵێی شەرمین.

– پێم وایە ئەمە هەلی خۆمە و بۆم هەڵکەوتووە، مام کازم.

– ئافەرین، بتڕەژم، دەزانی کچێکی چەند جوان و شۆخی، ئەوەندەش ژیر و زیرەکی. کەواتا دوو سبەی خۆت ئامادە کە. هەر لەگەڵ ڕۆژ گزنگی دا بۆی بەڕێ دەکەوین.

پووریێ بەناقایلییەوە هەڵی دایە:

– نابێ، شتی وا چۆن دەبێ؟ جا من ئەم کارمامزە بێوەیە چۆن دەدەمە بەر کەڵبەی گورگی ناو ئەو شارە گەورەیە.

– کارمامزەکەت، نەتووشی داو و تەڵەکە دەبێ و نە گورگ. ئێ لەگەڵ ئەوەشدا...

شەرمین بەپاڕانەوەوە سەیرێکی ناو چاوی خوشکەکەی کرد، هەناسەیەکی هەڵکێشا، خوشکەکەی گوتی:

– جا قەی چێکا پووریێ. ئەمە هەلێکە و بەپێی خۆی هاتووەتە ماڵەوە بۆی؟ بۆچی دەس بەخێریەوە دەنێی؟

شەرمین بەگەرم و گوڕییەکەوە ماچێکی خوشکەکەی کرد:

– دەمزانی تۆ خوشکی دڵسۆزمی ئامینە گیان، دەمزانی ئەوەتا تۆ...

بەری بەلای پووریەوە کرد:

– نایەڵم غەریبیم بکەی. مانگانەکەمت هەموو بۆ دەنێرم، هەمووی. باشە مام کازم، جا لە کوێ دەبم، چۆن بەڕێوە دەچم؟

– لەو جێگەیە، کە بۆ دەورەکە تەرخان کراوە، هەر لەوە لەسەر ئەرکی نەخۆشخانەکە، دەشخۆی و دەشنووی.

– هەروا بەخۆڕایی؟

– بەڵێ بەخۆڕایی، چونکە دەتکەن بە سستەر.

پووریێ گوتی:

– پیاو بڕوایی بەشتی وا نایە. شتی وا چۆن دەبێ؟

مام کازم پیاڵە چا بەتاڵەکەی لەسەر ژێر پیاڵەکە دانایەوە و هەستا، پێڵاوەکانی لە پێ ڕەقەکانی هەڵکێشا، گوتی:

– مادام شەرمین بیەوێ، هەموو شتێ هاسانە. من نایئاڵۆزێنم، لێت یاخی بێ، بەڵام هەقی ئەوەشت نییە ڕێگەی بەختەوەری و دواڕۆژی لێ بگری.

– پاش ئەوەی هەموو بەخەمبارییەوە مرومۆچییەک دای گرتن.

سەرەڕای ئەوەی کە شەرمین دوو حەوتوو بوو ڕۆیشتبوو و لە بەغداوە کاغەزی چاک و چۆنیی ناردبوو، خەمباری و مرومۆچییەکە هێشتا هەر بەماڵەوە دیاربوو.

هەموو شتێ لە بارودۆخی خۆیدا بوو، بەڵام ئەو گەرم و گوڕییەی جارانی نەمابوو. شەرمین کانگای خۆشییەک بوو لەبن نەدەهات.

ئامینە تا نیوەڕۆیەکی درەنگ، سەرگەرمی دەور و دەرز بوو، ماندوێتی و خەوەکوتکێ تەواو کەشەنگی کردبوو، خواخوای بوو نەختێ هەڵاژێ، تا وشت و گوڕێکی تێ گەڕێتەوە.

هەرچی کوڕە گەورەکەیان بوو خەریک بوو ڕەنگ و ڕووی لاوێنیی لێ دەنیشت، نەختێ زووتر لە قەراخ شار گەڕابووەوە. هەروا لەبەر خۆیەوە دەیبۆلاند:

– چی وام بەگیرنەکەوت مانگاکانی پێ تێرکەم. ئەمە چۆن وشکە ساڵ و قات و قڕێکە، ئەم حەمکە بارانەیش باری، کەچی هیچ، لە بەرد و تاوێر و لیتاو بەولاوە هیچی تر نییە.

دایکە هەستی بەپەشێویی کوڕەکەی کرد، گوتی:

– لای ئێمە، هەموو ساڵێ گیانلەبەر ماوەیێ تووشی بێ لەوەڕی و برسێتی دێن، بەڵام هەر کە زستان بەسەرچوو و بەهار هات، هەردوو مانگاکە دەبەی بۆ حەسەناوا، لەوێ لە کن کوێخا قادری بەجێ دێڵی، چاوی پێت بکەوێ، کۆڵێ دڵی پێت دەکرێتەوە، چونکە لە باوکت دەچی ئەحمەد. باوکتی زۆر خۆش دەویست. دە دەست و دەم و چاوت بشۆ، نانەکەت بخۆ، لە دەورت گەڕێم.

بەڵام خوا کردی، دیمەنی ئەم تاڵی و کوڵ و کەسەرە تا سەر نەبوو. هەر لە دوای مانگێ پۆستەچییەکە نامەیەک و حەواڵەیەکی بۆ هێنان، گوتی:

– دایکی ئەحمەد، بچۆ بۆ پۆستەخانە، پارە وەرگرە.

ها ئەم پسووڵەیەش لەگەڵ خۆتدا ببە.

– پارەی چی کوڕم، کام پارە؟

پۆستەچییەکە سەیرێکی پسووڵەکەی کرد:

– ئەو پارەیەی کە لە بەغداوە بۆت نێردراوە، دە دینارە.

پووریّ دڵی بەکوڵ هات، فرمێسک بەچاویدا هاتە خوار. وەک لەسەر ئاگر بێ، سا هەر چۆنێ بوو، خۆی گرت چاوەڕێی ئامینەی کرد، لە فێرگە بگەڕێتەوە، کاغەزەکەی بۆ بخوێنێتەوە و چاتری لێ حاڵی بێ، ئەوەشی لێ حاڵی بکا، پارەکەی چۆن وەرگرێ.

هەرچەندە، ترش و تاڵی و گرژ و مۆنی، کەمێ، وردە وردە ڕەوییەوە، زەردەخەنە و ڕەنگ و بوو و ڕووخۆشی گەڕانەوە سەرلێوان، بەڵام مەسەلەکە بەلای شەرمینەوە وا نەبوو لە بەغدا.

سەرەک بژیشک بەنەرم و ناسکییەکەوە گوتی:

– زۆرم هەوڵ دا بچیتە دەورەکەوە، بەڵام قوتابی دەبێ شایەتنامەی خوێندنی سەرەتایی هەبێ، جا لەبەر هەندێ، وام بەچاک زانی لە قاوشی ژنانت بەهاریکار دامەزرێنم. قاوشەکە ڕاستەوخۆ لە ژێر چاودێریی خۆمدایە. لەوەش دڵنیا بە کە وەک سستەرێ تەماشا دەکرێی و هەرچییەکی بۆ سستەرێکی چاک و لێزان پێویست بێ بزانێ، لە سستەرە پسپۆڕەکانی قاوشەکەی فێر دەبی. دەبێ بڕوات بەقسەکانم هەبێ شەرمین، ئەمنیش زۆرم مەینەتی کێشاوە. باوکم سەوزەفرۆشێکی ساویلکە بوو، هەژاریش بوو. ناهومێدی و هەناسەساردییەک کە خەم و پەژارە لە مرۆی بار دەکا بەسەبر و بردەباری نەبێ چیی دیکە سووکی ناکا. ژوورێکی چکۆلانەم لە پاین قاوشەکەوە بۆ جوێ کردوویەوە. شرە و پڕەی تێدا بوو، بۆیان ڕێک خستووی و چیت پێویست بێ تێیدایە.

شەرمین بەمنەتباری و سەردانووشتاندنەوە ویستی دەستی دکتۆر کەمال ماچ کا، دکتۆر ئەستەغفیروڵڵایەکی گوت و پاش و پاش کشایەوە، دەستێکی بەسەر و قژە سوورەکەیدا هێنا، هەر دەتگوت خەیاتەی خاوە.

شـەرمـین لەو ژووره چكۆڵەیەدا پازده مـانگی خشـتی گوزەراند، لـە سـەعـات هەشـتـدا لە قـاوش دەچووە دەرەوە، دەهـاتەوە ژوورەكـەی خـۆی. چراكـەی پێ دەكـرد و دەسـتـی بەخـوێندنـەوە دەكـرد، سبـەینـان ئاو و هـەوا بەهـەر چـەشنێ بوایە، پەنجـەرەكـانی دەكردەوە و دەیـڕوانییـە زەوی و زارێكی پڕ كشـتـوكـاڵ سـەوز و ڕەنگـاوڕەنگـی دوور، خـانووبـەرەی چـكۆڵـە چـكۆڵەی لـێ دروسـت كرابوون، یەك لێره یەك لەوێ.

كـاتی هـەره خـۆشـی ئـەوە بوو كـە مـانگانـەكـەی بـۆ پۆسـتـەخـانـە دەبرد. مـانگانەكـەی سـەرلەبـەر بۆ پووریێ و ئـامـینـەی خـوشكی دەنارد، ئەویش لە فێرگەی فێركاران دەیخوێند لە شار.

ناوبەنـاو دیاریشی بـەناوونیـشـانـی ئامـینەی خـوشكیـەوە دەنـارد. لە جل و بەرگی گـەرم و گـوڕی زسـتـانـە، لە بابەتی شـتی جوان و سـووكـەڵە سـووكـەڵە، شـتـی جـوان جـوانی بـۆ دەنارد، لێی دەبوون بەنەخش. دیارییـەكـانی زۆریان لەوانە بـوون، كـە نەخـۆشـان لەپاش مـنداڵبـوون دەرچوونیـان دەیانـدانێ. زۆر بەتەنگ پـاره كۆكردنەوە بوو. دەیتـوانی مـانگانەكـەیان سـەرلەبەر بۆ بـنێـرێ و هـەرچییـەكیشی لـێ زێدە بوایە پاشـەكەوتی كردبا. خـۆی ئاتاجی بەهیچ نەبوو. تەواو شـارەزای ناوشـار بـووبوو، لە ڕۆژانی پشـوو وچاندا لە نەخـۆشخـانە وەدەردەكەوت، بەبازاڕ و جێگەی ئاپۆره و قەرەباڵغدا دەگەڕا.

جگە لە شتهایەك كە سەر بەپیشە و كارەكەی بوو، زۆر شـتی تر فێر بووبوو و تەواوێ چاوی كرابووەوە. تەنانەت زۆر لەوانی كە لە مێژترەوە سـستـەرییـان كردبوو بەدەستوبردتـر و لێوەشاوەتر بووبوو، بگره لەوان زۆرتریش و چاتریش فێر بووبوو.

دەتگوت هـەر بۆ ئەوە گـووراوە، مل لەبەر ملـی ژنـان بنێ و كـۆڵ بەتەنگانە و هـەڵـەمـووت و تووشـیـی دنیـا بدا. خـۆی لـەسـەر بـردەباری و كـۆڵـنەدان و هـەڵنەهاتن تەواو ڕاهێنا و لەم خۆڕاهێنانەشدا، پیاو هـەق بڵێ، سەركەوتبوو.

لەو مـاوەیەدا زۆر كـەس داوای كـردبوو، جـا بەڕاسـتـیش شـەرمـین بووبوو

بەکچێکی تا بڵێی شۆخ و جوان و ئەوەندی دڵ هەڵبگرێ تەڕ و بڕ و ژنێتیی لێ هەڵدەقولا. ئەوەتا دیسانەوە خوازگێنییەکی دیکەی بەپاشەوە دا.

ئیحسان لاوێکی خاوەن شایەتنامەی زانستگا بوو، تا بڵێی لەبار و ئاکار و ڕەوشت هەموار بوو. یاریکاری حسێوگری نەخۆشخانەکە بوو، پاش ئەوەی کە هەرچی واسیتە و واسیتەکاری هەبوو چی لێ شین نەبوو و هومێدبڕبوو، ڕۆژێکیان یەکسەر خۆی پێی گوت:

– گوێ دێرە شەرمین، با یەکڕاست بچینە ناو مەسەلەکەوە. کارەکە پێوەندیی بەهەردووکمانەوە هەیە. نەک ئێستا، تەنانەت دوارۆژیش، زۆر زەحمەتە پیاوێکی وەک منت دەس کەوێ، خۆشی بوێی و هەموو جۆرە پێداویستێکی ژیانی هاوسەریت بۆ دابین و فەراهەم بکا. چیی منت بەدڵ نییە شەرمین؟ دەبا لێرە نەختێ دانیشین، خۆ هەموو دەزانن من خەریکی ئەوەم بتهێنمە ڕەدایێ.

– کاک ئیحسان من لە کەس ناترسم.

بەتەک یەکەوە لەسەر یەکێ لە تەختەکانی ناو باخچەکە دانیشتن.

– دەمەوێ بزانم بۆچی شووم پێ ناکەی شەرمین؟

بە تاڵییەکەوە بزەی هاتێ:

– جا هیچ پێویست دەکا پێت بڵێم بۆچی؟

– هەوڵ دەدەم بزانم. تۆ بۆ خۆت دەزانی من چەندم هەوڵدا. کەچی تۆ وەک بەردی وڵاتەکەت وای، دە نەختێ ببزوێ شەرمین، نەختێ نەختێ بۆ دوارۆژ.

– من قسەی خۆم کرد کاک ئیحسان، زۆریشت ڕێز لێ دەگرم. لەوەش زۆر دڵنیام کە لە تۆ چاتر کەس خوازبێنیی نەکردووم. ئەگەر دوارۆژیش دەفەرمووی ئەوە بەدەست کەس نییە و کێ دەیزانێ، یا شتێکی پێوارە و لە پشت ڕۆژگارێکەوە چی لێ نازانین.

– ئەمە دوا بڕیارتە شەرمین؟

شەرمین بزەیەکی ناسکی پشووکورتی خەماویی هاتێ:

– جا بۆچی ئەو درشتییە لە قسان بار دەکەی کاک ئیحسان؟ من خواستم بەپاشەوە نەداوی، عوزرم بۆ هێنایتەوە.

– ئەمە لە کارەکە چ سووک ناکاتەوە شەرمین، بەپاشەوەدان بێ یا عوزرهێنانەوە، زەبریان یەکە. شەرمین زۆرم حەز دەکرد زانیبام لەبەرچی، هیچ کۆسپێکی لە دەسەڵات بەدەر لە گۆڕێدا هەیە؟

شەرمین بەدەنگێکی نزم هاواری کرد، وەک بقیژێنێ:

– تۆش پوورم ئاسایی ئیحسان، دەتەوێ بێ ئەوەی ئازارم بدەی بەخواستی خۆت بگەی. من کیژێکی تەواوم، بۆ گومان ڕەواندنەوە، هەروەک بەپوورم دەگوت، بەتۆش دەڵێم، من کچم، هێشتا کچێنیم وەک خۆیەتی و لەجێی خۆیەتی ئیحسان.

– شەرمین گیان، تۆ بۆ خۆت دەزانی کچ چەند زۆرە.

– دەشزانم چەندت گەڕ و خول دەدەن و زۆریشیان چاوی تەماح تێ بڕیوی.

– دەی کەواتا بۆچی شووم پێ ناکەی؟ پشووێکی درێژت مۆڵەت بدەم، جارێکی تر بیر بکەیەوە؟

– ئەمە کەڵک ناگرێ، بڕیارێکی کۆنە و تازە بڕاوەتەوە، پاشگەزبوونەوەی لێ ناکرێ.

ئیحسان دەستی خستە نێو هەردوو دەستییەوە، بەپاڕانەوەوە، گوتی:

– باشە بۆچی شەرمین؟ بۆچی؟

شەرمین پشووێک چاوی قووچاند، گوتی:

– من کیژە گوندییەکم. لەم شارە گەورەیە شتی زۆر فێربووم، بەڵام هێشتا هەر گوندیم.

– شەرمین؟

– قسەکەم پێ مەبڕە تکا دەکەم، ئیحسان.

پێش ئەوەی لافاو گوندەکەمان ڕاماڵێ مانگایەکمان هەبوو، مانگایەکی زۆر

چاکیش، مانگایەکی بەشیری جوان. بڕوا بکە، لە گایەک بەهێزتر بوو. لە گایەکی کە باوم لە جووتی دەبەست، بەڵام سەد حەیف و مەخابن ئیحسان...

- حەیف و مخابن بۆچی شەرمین؟

- بۆ ئەو مانگا جوانە بە شیرە، هەموو ساڵێ یەک لە دووی یەک گوێرەکەی مرداروەبووی دەبوون. هەرکە دەزا گوێرەکەکەی بەسەر پێیان دەکەوت و نەدەکەوت، چوارپەلی دەلەرزی و دەکەوت، ئێمەیش گوێرەکەکەمان کەوڵ دەکرد و بەکا دەمانئاخنی و مانگاکەمان پێ دەباناند و بەو جۆرە دەماندۆشی تو خوا بەزەییت پێدا نایەتەوە ئیحسان؟

- زۆریش، بەڵام هیچ چارەسەرێکی نەدەکرا.

- نەخێر، هیچ چارەسەرێکی نەدەکرا.

- باشە، مانگاکەتان فرۆشت؟

- نەخێر، هێشتا هەر ماوە و شیرێکی خەست و خۆڵیش دەدا.

- بەسزمانە.

- چاوت لێیە تۆیش پێ لە بەسزمانییەکەی دەنێی ئیحسان. جا منیش وەک مانگایەکە شوو بکەم، منداڵی مردووم دەبێ.

- باشە تۆ ئەم هەموو تفەنگ بەتاریکەشەوەوە نانەت لە کوێوە هێناوە؟ شەرمین ئەوێ مانگایەکی نەخۆش و دەردەدار؟

- منیش وەک ئەوم، لە شتێکدا هەرتکمان هاوبەشین. زۆری خۆش دەویستم، داوێنی کراس و کەوایەکەی دەجویم. هەر بۆ دۆشینی، لێی نزیک دەکەوتمەوە، چی لە گواندا بوایە بەچاوێری و دڵاوابییەوە هەمووی دەدا.

- ئەگەر لەمە دەترسێی شەرمین. بەڵێنت دەدەمێ هەرگیز، منداڵمان نەبێ.

- گوێرەکە بنیادەمانەی مردوو، ئای کە خەونێکی خۆشە، بەڵام ئەمە قەت نابێ و بەدی نایە.

- شەرمین، تۆ ژیانێکی تەڕ و پاراو لە گێژەڵووکەی خورپە و هەراسانیدا،

لەناو دەبەی، تۆ لەم ڕۆژانەدا زۆر بێ حـاڵ و کـەشـەنگی. بۆچی سـبـەینێ سەردانێکی دایکم ناکەی لە ماڵی خۆمان، سبەینێ هەینییە.

– حـەزم دەکرد ئیحسان، بەڵام لەوە دەترسم، ئەوەندەم زۆر لێ بکا، خـۆم لەبەری نەگرم و منداڵی مردووم بۆ کوڕەکەی لێ بکەونەوە. ئەمەم زۆر جار لە نەخۆشخانە دیوە ئیحسان. دەبینی هەر منداڵە لە دایک دەبن و هەموو لەش ساغ و ڕوختە و پتەو، کەچی زۆری پێ ناچێ ملیان لار دەبێتەوە. بەڕاستی کـارەسـاتێکی گـورچووبڕە، بریا دەم و چاوی دایکیـانت لە جـەنگەی مەینەتییەکەدا دەدیت، جا ئەوسا بزانە بیرت لە ژنهێنان دەکردەوە قەتت بیر لەوە دەکـردەوە ئەو هەمـوو ئازارە لە دڵی ژنێکی بەڕاست خـۆشت ویستـبێ ڕۆکەی.

– شەرمین وام بەخەیاڵدا دێ،

– منیش هەروای دەبینم، ئەمە بەلای منەوە سێ و دووی نییە، هەوڵ و دەوڵ بێ سوودە. من زۆر ماندووم. پێویستیم بەهەر شتێکی ئەم مەینەتییەم لەبیر بباتەوە، هەیە.

– خـەم و پەژارەکـەت بەسـەر دڵی مندا دەی، من دەتوانم ئەمە بکەم، جێی هەموو شتێکی تێدا دەبێتەوە، چونکە جێی ئەوینی تۆی تێدا بووەتەوە، ئای کە چەند گەورە و فرەوانە، بریا دەتزانی.

– وا وچانی فراوینە، دەبێ لەوێ بم.

– دەبا بەتەلەفۆن داوای ژەمێ فراوینت بۆ بکەم.

– نا، سـپـاست دەکـەم کـاک ئیـحـسـان. بەڵام پیـاو کە لەو داڵانە درێژەدا فراوین دەکا هەست بەدینجی و سەرسووکی دەکا. هێندێ جار دەچم هیچم بەرناکەوێ. زۆر خۆشـیی لەو زگە لە برسان بەپشتـەوە نووساوانەوە دێ کە چەند تیکۆکەیەکیان بەبێ جوینی تەواو بەپەلەیەک تێ دەکەون.

– کەواتا هیچ.

– هیچ تroووکـەیێ نییە. بەداخـەوە کاک ئیحسـان، من خۆم نائومێدم و زۆرم

پێ ناخۆشە یەکێ لە ئاواتە بێ تاوانەکانی تۆیش تووشی ناکامی دەکەم.

شەرمین هەستا، زۆری لەپێش چاو بڵیند بوو، ڕۆژ بەسەر قژە خورماییەکەیدا دەباری و لەگەڵ سرەوتن و مەندبوونەوەی بادا ئەویش بێ خەم سرەوتبوو.

– چەند شۆخ و ژیکەڵەی شەرمین، هەرگیز لەبیرم ناچییەوە. چ ژنێ هەیە ببێ بەژنی من و بتوانێ جێگەی تۆ لە دڵ و دەروونمدا پڕ کاتەوە.

– خوا خۆشت کا، کاک ئیحسان. منیش بەچاک یادت دەکەمەوە، تۆ کوڕێکی چاک و ئاکار بەرزی.

– دەشتپەرستم.

– کەواتا، وای لەم بتە دڵڕەقەی کە دووعا و پاڕانەوەکەم لە نیاز و مرادم ناهومێد دەکا. بەخوات دەسپێرم.

بەئەسپاییەوە، بەڕێرەوە قیرتاوکراوەکەدا، بەرەو ژووری نانخواردن دای کێشا. گیاوگۆڵ تا نێو ڕێڕەوەکە داکشابوو، بووبوو بەخلیسک.

ئیحسان، تا کچە لە پێچەکەی پێش ئەزموونگەکە وەرچەرخایەوە، هەر لەوێ مایەوە. ویستی زێتر بمێنێتەوە، نەیتوانی لەسەر لاقی ڕاوەستێ. پێی لە پشت تەختەکەوە درێژکرد، بەپاژنەی لەقەیەکی پێدا کێشا، دەیویست خوێنی تێ وەرگەڕێ، لە پاشان ڕاست بووەوە، ڕۆیشت، بەکوڵێ پەژارە و خەمەوە، چووەوە بۆ شوێنەکەی خۆی.

شەرمین بەدرێژاییی نیوەی شەوگار خەو نەچووە چاوی. چەخماخە و هەورەتریشقە دنیای کەڕوکاس دەکرد و دەینەڕاند. باهۆز لک و چڵی دار و درەختی دەهێنا و دەبرد، هەر دەتگوت هەلۆرکن و سەرچڵانی بەجۆری دادەنەواندەوە هەر ئەوەبوو لە ڕیشەی دەرنەدەهێنان. لە پەنجەرەکەوە لافاو و لاسامە دیاربوو، پڕ بەئاوەڕۆ و جۆگەلان هەستابوو، شۆسە و تەختە هەرێزەکانی بەبنەوە دەکرد.

هەرچەند، شەوانە عادەتی وا نەبوو چرا نەکوژێنێتەوە، بەڵام ئەو شەوە

نەیکوژاندبووەوە، پێی وابوو لاشانێ بەگوڕ پاڵ بەدەرکەوە دەنێ.

– دەبێ، بابێ.

زریکاندی:

– کێ پاڵ بەدەرکەوە دەنێ؟ کێیە؟

کەس وەڵامی نەدایەوە، بەڵام دەرکە بەشەق و شـۆق کەوتبوو، هاواری کرد. ڕێگە و ڕێرەوی قـاوشــە تازەکـان بارانێکی زۆریان لێ دەباری، بەڵام ژیانی خەڵکەکە هەر لەسەر بارتی خۆی دەڕۆیشت. گوێم لە هەراوەزەنا بوو، گوێم لێ بوو خـــەڵکی لە ئۆتۆمــبــیل دادەبەزین. دەبێ ژنێکی دیکەشـــیــان بە ژانی منداڵبوونەوە هێنابێ و منداڵەکەی بەئاسانی نەبووبێ. جارێکی دیکە بەدەنگ هات:

– ئەوە کێیە پاڵ بەدەرکەوە دەنێ؟

– بیکەوە شـەرمین. شـتی لەناوەخت ڕووی داوە هێندێ خـانووبەرەی کـۆن بەسـەر نیشتەنییەکانیاندا ڕووخاون. نەخۆشـخانەکە پێویستی بەیارمەتیی هەمووانە. بەخۆکەوە، تکا دەکەم.

– بەڵام من...

– لەهەر بارێکدای، خێرا کە، وەرە بەڕێوە.

لە بەرەبەیاندا، بەشـەکـەتی و مـانـدوێتی گـەڕایەوە بۆ ژوورەکـەی. خـۆیشی نەیزانی چۆن خەوی پێ داکەوت، بەڵام زۆری نەکێشا، بەخەبەرهات مۆتەکە سواری سینگی بووبوو، کاتێکی بەخۆ زانی پەتۆکەی کەوتە خوارەوە، دەستی لە لێواری قەریوڵەکە توند کرد.

مۆتەکەیەکی زۆر قورس و گران بوو، هێشـتـا ترسـەکەی لێ نەڕەوابووەوە ئەمجارە خۆی لەوێ دیتەوە، نەک لە گوندەکە، لەو سەر چیایەی خێوەکەی لێ بوو، مــەزرا تووتنەکــە بەرز بووبووەوە، پڕ لە گــەڵای پان پان. لەپاشـــان خـێـوەکەیشی دیتـەوە. تەمـاشـای کـرد، وەک خـەڵکەکـە باسـیـان دەکـرد بەو چەشنـەیە. بەســـینگی ڕووت و تەنیـــا باسکێکەوە لە زارکی ئەشکەوتە

تاریکەکەوە دەردەهات، شیرێکی لێ دەدا، کە شیرەکەی ڕاست دەکردەوە، خوێن فیچقەی دەکرد و وەک فوارەی گڕ و بڵێسە بەرز دەبووەوە.

خوێن لە یەک ئاوەڕۆدا جۆگەی بەستبوو و بەناو مەزرا تووتنەکەدا، بەڕاست و چەپ ڕێی دەکرد. پاشان شتێکی سەیری دیت. تەماشای کرد، خێوەکە شیرەکەی بەهەموو گوڕێکییەوە هەڵدا و بەسینگی گرتییەوە و بەلادا هات و کەوت.

ئینجاکە، سێلاوی خوێنی برینی گاشەبەرد دەوەستا. ئەمە خەونێ بوو. بڕایەوە، شتێ لەوێ ڕووی دا.

شتی وا زۆر جار ڕووی دەدا، باوی، کە دەگەڕایەوە، هەمووی بۆ لە نووکەوە دەگێڕایەوە، بەڵام ئێستا نە باوکی دیارە و نە هیچ. باوکی تازە ڕابرد. خێوە دواکاغەزی ڕاگەیاندێ، ڕای گەیاندێ ئی دی بڕایەوە، بە شیرەکەی هەموو شتێکی بڕییەوە.

– شەرمین.

– بەڵێ.

– ئەمە چاشتەکەتەکە، دوکتۆر گوتی بۆی بەرە. دوێ شەوێ بۆ هەمووان ناخۆش بوو. دە دەرکە بکەوە، شەرمین.

شەرمین ڕاست بووەوە، دەرکەی کردەوە. ئەو ئافرەتەی نان و شیوی بۆ نەخۆشان دادەنا مێزە دارینەکەی بەخواردنەکەوە لە پێش دانا و ڕۆیشت، هەروا لەبەرخۆیەوە گوتی: «بەڵێ شەوێکی زۆر ناخۆش بوو، کێ بڕوا دەکا ئەمە شەرمین بێ.»

کووپێ شیری تێ کرد و نەختێ کەرە و تۆزێ مرەبایشی بەپارچە سەموونێکەوە سوی. کە برسێتی زۆری بۆ هێنا تووشی سەرەخولێ و دڵ هەڵشێوانێکی ناخۆش دەبوو.

دوکتۆر لە ژوورەکەی سەرێکی لێ دا، بەوردی تەماشایەکی کرد، بزانێ چییەتی. لە چوونە دەرەوەدا، بەوانی لەگەڵیدا بوون گوت:

– پشووی حەوتوویێکی بۆ دەنووسم. تووشی نشوستییەکی سەخت بووە. ئێستا لە بارێکی دەمارگرژی و پڕکێشییەکی سەختدایە. لە ترسان وای بەسەرهاتووە. داخۆ ئەم کچە ئاکار ناسکە شەوێ چیی بەسەرهاتبێ. سستەرەکەی لەگەڵیدا بوو، گوتی:

– نەخۆشیی وا لەناکاو زۆر شتێکی پیسە. دەڵێن چاوی بەئافرەتێ کەوتووە لە حاڵی ژانی لەناوەختدا بووە. گوایە لە ژێر خانووی ڕووخاویان دەرێناوە و لەوەوە منداڵی لەبارچووە.

دوکتۆرەکەی دیکەیان گوتی:

– جا بۆ ئەمە کەمە. دیارە لە حاڵی وادا تووشی وا دێ، ئەی چۆن.

دوکتۆرە پسپۆڕەکە گوتی:

«مەسەلەکە لە حاڵی وادا لە گرێ و گۆڵێکەوە سەرهەڵدەدا کە لەنێو دڵ و مێشکدا پەنگابێتەوە...»

دیارە هەراسانییەک کە پێشتر تووشی مرۆ بووبێ، لە جێی مەترسییەکی وریا دەکاتەوە کە سەر و شوێنی بەدی ناکرێ، ئەی شەرمین بەم دواییانە تووشی هەراسانییەک نەهاتبوو؟ خۆ من زۆرم سەرنج دابوویێ. یا تۆ بڵێی کارەکەم وا لێ ئاڵۆزکابێ، ڕواڵەت و هۆی ڕاستەقانیی مەسەلەکەم لێ تێک چووبێ؟ دووریش نییە وابێ، ئێمە، بەرەی دوکتۆران زۆر جارمان بەو جۆرە لێ دەقەومێ.

٦

شەرمین سوودێکی چاکی لە ماوەی حەسانەوەکەی وەرگرت. ڕەنگ و ڕووی هەڕەتی جوانی و مێیایەتیی تێ گەڕایەوە. بەڵام شتی وای لێ ڕوودا کە بەبیردا نەدەهات. لەپاش حەسانەوەکە خەریک بوو بەرەو قاوشەکە بڕوا لە پڕ سەرسووڕکێی تووش بوو و هێڵنجی هاتێ.

دوکتۆرەکە بۆ ژوورەکەی خۆی برد. لە پاش پشووێکی چاک گوتی:

– هەست بەئازاری کوێت دەکەی شەرمین؟ خۆ ئەم جۆرە حاڵەتانە...

– هێشتا هەر کچم، گەورەم. ئەم جۆرە گومانانە بۆ ئافرەت بەڵای سەرە.

– دەزانم، شەرمین. دەزانم ئەمە بێزوو نییە. من لە داوێن پاکییەکەت دڵنیام. بەڵام ئەم حاڵەتە، دەبێ هۆی ڕاستەقانیم بۆ یەکلا کاتەوە. ناکرێ بەهەردوو لامان ئەمە یەکلای کەینەوە شەرمین؟

– گەورەم، چی خۆت دەفەرمووی و چۆنی بەچاک دەزانی ئاوا دەکەم.

– چاکە تۆ چی وات لێ دەکا هەست بەسەرەخولێ و دڵ هەڵشێوان بکەی؟ ئەمە ناوبەناو لە ترسان ڕوودەدا. ئەمە جۆرێکە لە هەڵاتن و خۆ لەپەنا بیانگە شاردنەوەیەکە، لە بیانگەی نەخۆشیی لەش کەمتر و پاینترە.

– ڕەنگە لەبەر ئەوەی، کە وەختی خۆی مۆتەکەیەکم دیتبێ، لەو لادێیە تاپۆیەکەم لەخەونمدا دیت، بە شیرەکەی لە بەردی دەدا، خوێنی بەکوڵ دەتەقییەوە، خوێن بەکفەکفێکی ماسیاوەوە بەلاکەناری چکۆلە چکۆلەدا ڕێچکەی دەبەست، دەڕژایە ناو کێڵگە تووتنەوە.

– کەواتا خوێن؟ دیارە هیچ منداڵ بوونێکیش بێ خوێن نابێ، تێ گەیشتم. چ دەڵێی ڕاگوێزرێیە قاوشێکی دی؟ خۆ تۆ بۆ خۆت دەزانی چەند دۆستی دوکتۆر قەدریی سەر بژیشکی قاوشی نەخۆشیی دڵم. تاقییەکی بکەوە، لەوێ

کار بکەی، لەوێ شتێکی تازە فێر دەبی.

– جا قەت ئەو چاکەیەتم لەبیر دەچێ گەورەم، خوشکەکەم وا لە دوا ساڵی خوێندن دەبێتەوە، هەر کە بوو بەفێرکار، لە هەر کوێیەک گیرسایەوە، پەنای دەبەمێ. ئەم ڕۆژانە چاک نیم.

مانگێکی لە قاوشی نەخۆشیی دڵ لێ بەسەرچوو، هەر بەو دەستوبردەی جارانی فێری هەموو شتێ بوو. ژوور بەژوور دەچووە ژووری بەبەرەخۆهێنانەوە. بەڵام سەرلەنوێ خورپە و هەراسانییەکەی هەڵی دایەوە.

– گەورەم، ئیتر بۆ کاروباری نەخۆشخانان دەست نادەم، چم بەبەرەوە نەماوە. لێکم دایەوە، دەزانم چەندم پاشەکەوت هەیە، دەتوانم دوو مانگان بەبێ کاری بمێنمەوە، ئەو ئەگەر ئامینەی خوشکم لێ بایەوە، ڕێ و ڕاست بۆ وێ دەگەڕامەوە.

– بەڵێ، تێ دەگەم چاک تێ دەگەم شەرمین.

– دە تۆ ودمێکی دیکەیش بۆ مەودای حەوتوویێ وەرگرە، پزیشکی قاوشەکە دەتداتێ، تەلەفۆنی بۆ دەکەم. دە برۆ پشووێکی بۆ بدە.

– بێ سوودە گەورەم. ودمەکە وەک جاران بەسەردەچێ و سەرلەنوێ بۆ خۆم دەگەڕێمەوە سەرباری پێشووم. پێم ناخۆشە نارەحەتت بکەم، گەورەم.

– نا نا، شەرمین، تۆ وەک یەکێ لە کیژەکانمی. من نەتیژە و تۆرە و سۆرەم سەرلەبەر کیژن. شانازیشیان پێوە دەکەم. شانازی بەتۆوەیش دەکەم.

لە ژوورەکە چووە دەرێ. بەوەڵام هێنانەکەی باوکانە بوو، شتێکی، دڵنیایی و شایی بەخۆبوونی پێ بەخشی.

لە ڕێگە تووشی کاک ئیحسان هات. بەخەمبارییەکەوە سڵاوی لێ کرد:

– بەنەخۆشییەکەت زۆر نارەحەت بووم، شەرمین، منیش وەک تۆ نەخۆش کەوتم. ئەوە دوو حەوتووە بە ودمم دەبینی.

– بێ وەی بی، لە ئازار بەدوور بی، بەڵام هەرچی منم، پێم وایە ژیانی من و نەخۆشخانەیان نەگوتووە.

– جێگەی تۆ مـاڵ و حـاڵێکی بەدڵی خـۆت و خـێزانێکی تازەیە، خـێزانێکی لەسەر بنچینەی خۆشەویستی ڕۆنرابێ.

– کاک ئیحسان؟

– هـەر هیچ ئومێـدێ نییـە، تەنانەت، پاش ئەوەی بەسـەریشت هات و منیش بەم حاڵە گەیشتم.

– دەبێ نەخۆشـخانە بەجێ بێڵم. کاری ئێرە کۆڵۆڵییەکم تووش دەکا. لە تاو و توانم بەدەرە.

– کەواتا وەرە، لەگەڵ دایکمدا پێکەوە بن. زۆرت خۆش دەوێ.

– بمبـەخشـە، بەخـوات دەسـپێرم. بۆ قـاوش دەچم نیـازم وایە ودمێکی تازە وەرگرم.

ودمـە تازەکە بۆ شـەرمین بەخـێر نەگەڕا. هێشـتـا هـەر زۆری ڕک لە دیمەنی خـــوێن دەبووەوە. زۆری لێ دڕدۆنگ بوو. ژیان هیچ شـــیـــاوی ئەوە نەبوو بەو هەست و خوستە وەک مەودای بیرتیژانەوە بەسـەر ببرێ.

بەدرێژاییی مـەودای ودمـەکـەی، نەخـۆشـخـانەی بەجێ دەهێـشـت. بەو ناو شــارە گـەورە بەربـڵاوە بەسـامـە دەکـەوت، لە فـەرامـۆشـیـیـەک، لە تـرووسکەی ئومێدێ دەگەڕا. لە هـەرجێیـەکی هەڵوێستابا برێ سـەرسـەری و هیچ و پووچی بەدوودەکـــەوتن، هـاوشـــانی دەوەســـتـــان، بەبیـــانگەی بەجـــوانی هـەڵدان و پـەسندانێکی زۆب و دزێـوەوە قـــســـــەی هـەرە پیس و بـەتوانج و تـەشــــەریـان داویشتێ و دەیانویست دەرکەی قسە لەگەڵداکردنی لێ وەسـەرپشت خەن.

ئەویش هـەر هێندەی بۆ دەکرا خـۆی لە گـەڕیان لادا، بەهـەمـوو ئاوڕووێکەوە، ڕەفــتـــاری تێک نـەدەدا، بەڕێی خـــۆیدا دەڕۆیشت. هـەرکــە ئێـــوارێ دادەهات دەگەڕایەوە بۆ ژوورەکەی خۆی.

لەسـەر داڵانەکە بوو، هەستی بەوە دەکرد بنمیچی ژوورەکە دەسـتێکی پێوار دەیهـەژێنێ و هـا ئێـسـتـا هـا نەخـتێکی دیکە بەسـەریدا دەتەپێ و بەبن خـاک و خۆڵ دەکەوێ.

دانیشت بەکاوەخۆ دەستی بەگریان کرد:

– خوایە چیم بەسەر هات؟ بۆچی ڕوو لە هەر کوێ دەکەم، مۆتەکەی ترسم لەدوو نابێتەوە؟

چیی بەسەرهاتبوو؟ تارماییەکەی شەوێ هاتبووە خەونی؟ جارێکی دیکەی هاتبووە خەون، بەڵام ئەوی ئەم جارەیان پیاوێکی چاکی سەر و ڕدێن سپی بوو. زۆر باوکانەی لەگەڵ جووڵایەوە:

– تا ئێستایش هەر لە شیر دەترسێی؟ خۆ نە شیرم ماوە و نە هیچ. کانیی خوێنی سوور و ئاڵی بەرد هەموو سپی هەڵگەڕاون، وەک فرمێسکی بێ خەوش کە لە ژێر پێڵووی سیحراوییەوە ڕێچکە دەبەستن دەچریسکێنەوە. بگەڕێوە بۆ ئەوێ شەرمین. بەهەر لایەکدا دەڕۆی تووتن بەژنە زەلامێ هەڵی داوە، تەنیا کێڵگەکەی باوکت نەبێ. خەڵف و نەمامە داربەڕوو بەکێڵگەکەدا بڵاوبووەتەوە، خەریکە دای دەپۆشێ، وەک پۆپەی کەژ و کێوانی داپۆشیوە.

– باشە، تارماییە پیاوچاکەکە دەتەوێ ببی بەهاریکارم لەم تاک و تەنیاییەمدا؟

– من هەر هاریکاری خەڵک بووم. هەمیشە دۆستی هەموو خەڵکی ئەو گوندانە بووم. بەدنیهاد و پیاوخراپ منیان کرد بەمێردەزمەیەکی بە سام.

– کەواتا، دەبێ ساڵێکی دیکەیش چاوەڕێ بکەم. کە ئامینەی خوشکم لەوێ بوو بە فێرکار، ئەوساکە منیش دەگەڕێمەوە بۆ گوند. ئاوەدانیان کردووەتەوە گەورەم؟

– بەڵێ. ئیتر لاسامە و لافاو، وەک جاران، ڕای نامالێ.

– دەڕۆمەوە گەورەم. بەڵام دەبێ لە پێشان لە ترس ڕزگار بم.

– ڕزگار دەبی، جا لە چی دەترسی شەرمین؟

لە ڕکان سەری بادا و چەپۆکێکی بەهەنییە ناسک و بێگەردەکەیدا کێشا. تیتکێ قژی خورمایی تەنکی پێدا شۆڕ بووبووەوە، هەر دەتگوت بڵێسەی دەمەوئێوارانە. لە وەڵامی پرسیاری مێردەزمەکەی، شەوێ هاتبووە خەونی،

گوتی:

- شەرمین لە چی دەترسێی؟ جا بەڕاستی من لە چی دەترسێم خوایە، دەبێ لە چی بترسێم؟ ئەوەی پێویستە بیکەم...

قەدەرێ بیری کردەوە، چ پکا، بەڵام هێشتا پێی لە کردنی شتێ تەواو دانەگرتبوو.

بۆ سبەینێ، چێشتانێ، چوو بۆ ژووەکەی دوکتۆر کامیل. دۆستانە بەڕوویدا گرژایەوە. ئەویش فرمێسک لە چاویدا قەتیس مابوو.

- گەورەم ئیتر بەکەڵکی ئێرە نایەم، پشوو و حەسانەوەیش هیچ دادێکم نادا، دەمەوێ بڕۆم، وا کاغەزم نووسیوە، تکام وایە لێمی قبووڵ بفەرموون. دەمەوێ دەست لەکار هەڵگرم.

- دانیشە شەرمین، خەریک بووم خۆم بانگت کەم. من لەوە دڵنیام کە تۆ کەڵکی کارکردنت پێوە نەماوە بەڵام نەک لە هەموو جێگەیێ، تۆ هێشتا لە هەڕەت و گوڕی لاوێنیدای.

دووکەڵێکی جگەرەی بە با دا، بێ ئەوەی خۆی هیچ بخاتە دڵییەوە، لە نەخشی دەم و چاوە پەشێوەکەی ڕاما، پرسی:

- بڕوات بە بەخت هەیە؟

- زۆریش گەورەم.

- کەواتا ئەم جارە بەختت دەیەوێ خزمەتێکی چاکتر بەژیانت پێشکێش بکا، دەڵێی چی؟

- دەرباری چی گەورەم؟

- دەربارەی کارێکی تازە، خۆش، ڕەحەت، متمانە بەژیانت پێشکێش بکا، دەڵێی چی؟

- تێ ناگەم گەورەم.

- کارێکم بۆ دۆزیویتەوە پڕ بەبالای خۆت و مووچەیەکی زێتریش. لە جیاتی

ئەوەی خـزمـەتـی سی نەخـۆش بکەی، خـزمـەتێکی کـەسێ دەکـەی چەند بڵـێی دڵاوا و پیاوی چاکە. تەنیا مرۆیەکە.

– تەنیا مرۆیەک؟

– پیـاوێکە لە تەمـەنی مندا و لە من بەدەوڵەت و سـامـانترە. وەختـی خـۆی سـامـانێکی زۆری وەسـەریەک ناوە و بەحـەڵاڵیشی وەسـەر یەک ناوە، بەڕەنجی شـانی خـۆی پێکیـەوە ناوە. ئەندازیارێکی مـیعمـاری بوو، مـقـاولیش بوو، بەڵام ڕۆژگار دەستی خۆی لێ وەشاند.

– نەخۆشـە گەورەم؟

– مـجـرۆیە، بەسـەر کورسـیـیـەوە دەگـەڕێ. پیـاوێکی جێ بڕوایە و لەجـێی باوکتـە، تا بڵێـی دڵاوا و بەبەزەیە. ئەگەر بڵێـم بەلای منەوە دۆسـتێکە هـەرگـیـز بێ ئەو هەڵناکەم ڕاست دەکەم.

– پێویستی بەخزمەتی ئینسانێکی ترە.

– خزمەتی کچێکی چاکی وەک تۆ.

– باشە تا ئێستا کێ خزمەتی دەکرد، گەورەم؟

– ژنێکی دیکـەی زۆر چاک خـزمـەتی دەکـرد، هـەر لەو ڕۆژەوە تووشـی ئەم نیوە مـجرۆییـیە بوو پێنج سـاڵی خـشـتی لە خزمـەت و چاودێرییدا بۆ تەرخـان کـرد، چونکە کـوڕەکـەی کـە بۆ بەرازیل کـۆچـی کـردبوو زۆری لێ پـاڕایەوە خـزمـەتی بکـا. ئەویش هیچ بیـانوویەکی بەدەسـتـەوە نەمـا لەوێ بمێنێـتـەوە، بەتایبەت دوای ئەوەی کە هەردوو کچەکانی گەڕانەوە بۆ ئەوێ.

– لە کەیەوە وا پێویستی بە منە؟

– حەوتوویەک نابێ. دوێنێ تەلەفۆنی بۆ کردم، چووم بۆ کنی، ئەم کارەساتە تازەی بۆ گـێـڕامـەوە. چا بوو بـەخـتـی هێنـای، ئەوا خـوا تۆی بۆ ڕەخـسـاند، خزمەتی بکەی.

دەڵێی چی؟

– ئەو ڕای چییە؟

– لەبەرئەوەی کە بەدۆستی خۆیم دەزانێ و زۆری متمانە پێمە، زۆری سوپاس کردم، گوتی ئەویش دەبێ بە کچی سێیەم.

– کەواتا پیاوەکە دوو کچی هەن گەورەم.

– بەڵێ، لە ماڵێکی تر دەژین. نێوانیان لەگەڵ باوکیاندا خۆش نییە، بەدەگمەن دیدەنیی دەکەن.

– بەماڵ و مێردن؟

– بەڵێ شوویان بەدوو پیاوی بەنامێی خاوەن کاروبار کردووە. کوڕی دۆستی کۆنین.

– قایلم. سوپاس، جا کەی دەفەرمووی دەست بەکار بکەم گەورەم؟

– دوای دەوام، ئەمڕۆ، لەگەڵ خۆمتدا دەبەم. جا ئێستا تۆ بڕۆ شمەکەکانت خڕکەوە، هێشتا دوو سەعاتمان بەدەستەوە ماوە.

– ئەی لە کار دەست کێشانەوەکەم؟

دوکتۆر کامیل گوتی:

– وا بزانە قبووڵ کراوە، پێشتر لەگەڵ کارگێڕی نەخۆشخانەدا قسەم کردووە. تێم گەیاندووە کە لە چ حاڵێکی نیگەرانی و ناڕەحەتیدای.

لە دالانەکە ئاودیو بوو و بەرەو ژوورەکەی وەرچەرخایەوە، لە وەرچەرخانەوەدا ئیحسانی تووش هات، هەر دەتگوت چاوەڕێی دەکرد.

– شەرمین؟

– ئیحسان؟ چۆنی، چاکی، چاتر دیاری.

– تۆیش شەرمین، تۆیش. قەتم وا بەم جوانییە نەدیتووی تا ئێستا. ئەوە بۆ کوێ دەچی؟

– وا خۆم کۆ دەکەمەوە کار بەجێ بێڵم، ئیتر کەڵکی ئەوەم پێوە نەماوە لێرە بمێنمەوە کاک ئیحسان، کار لەم ناو خوێن و ژان و ئازارەدا ڕەگ و ڕیشەی دەرێنام، دەبێ ئەوەندەی بە بەرمەوە ماوە فریای کەوم.

– جا بۆ کوێ شەرمین؟

– ها ئێستا دەست لەکارکێشانەوەکەم خستە بەردەم کارگێڕ، دەگەڕێمەوە.

– بۆ کوێ؟

بێدەنگی و پەژارە بەجارێ تەنگی پێ هەڵچنی، لە یەکبینە هەر پرسیارەکەی دووپاتە دەکردەوە:

– بۆ کوێ دەگەڕێیەوە شەرمین؟ بۆ کوێ؟

– بۆ شارەکەی خۆم.

– بۆ شارەکەی خۆت؟

– هەر کە گەڕامەوە بە بەختەوەریی ناو خێزان شاد و شوکور دەبمەوە لەگەڵ پوورمدا، لەگەڵ هەردوو کوڕەکانیدا، کە لێیان دابڕام هێشتا هەرزەکار بوون. سوپاسی بەتەنگەوەهاتنمت دەکەم.

ئیحسان گەرووی پڕ بوو لە گریان، فرمێسکەکانی لێ بوون بە شتێ لەمەودای گوێزان دەچوو. بەلادا هات، چابوو خۆی بەدیوارەکە گرتەوە..

– منیش دەڕۆم.

– بۆ کوێ کاک ئیحسان؟

– بۆ دوور، بۆ جێگەیەکی دوور، زۆر دوور.

– بۆ کوێ؟

– بۆ بەرازیل شەرمین. دایکم میراتییەکی بەرکەوتووە بەبیردا نایە، نیوەی بۆ من داناوە. دەڕۆم ساڵێ لەوێ بەئاسوودەیی بژیم.

– ئای کە شتی چاکە. ئیتر هەست بەئازاری ویژدان ناکەم. خوا حافیز، هیوادارم کە دەگەینەوە یەک زۆر بە بەختەوەریت ببینمەوە.

دەرکەی پێوە دا. قەدەرێ بە دۆشداماوی مایەوە.

پەنجەرەکە نیگا وەک پشکۆ گەشاوەکەی بەرەو دیمەنگەلێ ڕادەدا لە دیتنیان ڕاهاتبوو. تا چاو بڕی دەکرد خانوو و بەرەی تازە بوو و بەو کێڵگە و

بێـسـتـانانـەوە بڵاو بووبوونـەوە، بەڵام قـەراخ شـاری تازە پەیدا بوو خــەمڵ و ڕەوشـی پێ نەهێشتبـوون. پاشان بەئاگا هاتەوە، دەبێ چ بکا؟ ژیان ئەمەیە. لە پێنـاوی وەدەسـتـهـێنانی شـتـێکی تازەدا، دەبێ کـۆنەیـەکی لێی ڕاهـاتووین، لەدەست دەین، لێ ڕاهاتنێکی تاڕادەی لێ وەڕەز بوون.

تەمـاشای کرد ئیحسان لە دەرگانەی نەخۆشـخانەکە پاڵی بەدارێکەوە داوە جـانتـایەکی پێ بوو هـەرچی شـتی دڵخـوازی بوو تێیدا بوو. چاوەڕێی دوکتـۆر کامیلی دەکرد، دەگەڵە خۆی ببا بۆ کارە تازەکەی. لە پڕ خەم دای گرت، بۆچی ئەو درۆیەی لەگـەڵ ئیـحـسـانی لاودا کـرد. کوڕە لە پێش چاوی ڕاوەسـتـابوو، خۆی بە لکی دارەکەوە شۆڕ کردبووەوە.

دوکـتـۆر لە دوورەوە دەسـتـی لێ هەڵتـەکاند، کـیـژە بەتاو چوو بـۆ کنی. هـەر هێندەی بڵـێی یـەک و دوو لە بەرچاو ون بـوو، لە پێـچی مـەیدانەکـە، لە چاوی ئیحسان ون بوو. کچە هـەردوو چاوی پڕبوون لە فرمێسک.

***

– شـەرمین ئەو کتێبە سێیەمەکەت بۆ هێنابام.

– کتێبی سێیەم؟

– ئەوەی لە ڕیزی سێیەمدایە، بەلای ڕاستەوە.

شـەرمین چوو کتێبەکەی هێنا.

پیاوە چەند لاپەڕەیەکی لە کتێبەکە ئەمدیو و ئەودیو کرد، گوتی:

– ڕووناکی کزە، پەردەی پەنچەرەکانت نەختێ هەڵدایەتەوە. ڕووناکییەکی لە هەرەتی لاویدا بەشـی دەکردین ئەوڕۆ بەشـمـان ناکا. سـوپاس، خـۆ ناڕەحـەتم نەکردی؟

ئەوەندەت شت لێ داوا دەکەم وەڕزم کردی.

– نا، مامە، ئەی من بۆ لێرەم.

– چاوت لە ڕووناکی بێ چەنـد خۆشـە. بەڕاسـتی ڕووناکیی ڕۆژ جـوانە. ئەم کتـێبە کۆنە. پیـاو خـواخـوای ئەوەیەتی شـتێکی دەیخـوێنێتـەوە، جار لە دوای

جاری بخوێنێتەوە.

– ئەگەر چووبێتە دڵیەوە.

– ئەگەر پێویستی پێ بێ. من پێویستم پێیەتی، بۆیەی دەخوێنمەوە. هەرچەندە پێم وایە ناوەڕۆکەکەی گۆڕاوە. زانست هەمیشە لە گۆڕاندایە، زوو زوو دەگۆڕێ. ئەوەی ئەمڕۆ لە کتێبێکییەوەی فێر دەبین زانستی سبەینێ لەبەریەکی هەڵدەوەشێنێتەوە.

– وەکو خۆمان، مامە.

– بەڵێ وەکو خۆمان. خۆ بەپێ لێ داگرتن نازاندرێ، داوای ئەو کتێبە بکەم، کە بەتەک ئەم کتێبەوەیە.

پیاوە قەدەرێ بەخوێندنەوەوە خەریک بوو. پاشان وازی لە کتێبەکە هێنا و کورسییەکەی بەرەو پەنجەرەکە ڕادا.

– لەم تەمەنەدا پێویستمان بەزۆر شت دەبێ، چونکە جاران نەماندەتوانی هەموو شتێ بکەین. ڕووناکی لادەچێ سێبەر لەگەڵ ڕووناکیدا دەبزوێ.

– ڕەنگە لەبەر ئەوە بێ، پەردەکان ڕەنگیان تاڵە. گوڵووک و خەتخەتۆکەی سووری بەپێچ و لوولی چەند جوانن، بەڵام ڕەنگ تاڵی، تاریکی...

– ئەگەر پەردەکانت پێ ناخۆشە، چۆنت ئارەزوو لێیە وای دەگۆڕین.

– ڕەحەتیی گیانی تۆم گەرەکە، گەورەم. ئەگەر حەزیان لێ دەکەی چ قەیدی هەیە. با بمێنێتەوە.

– خۆرەکە ڕۆیشت.

– ڕووناکییەکەیشی لەگەڵدا کشایەوە.

– هیچ شتێ، تا شتێ نەبا، ناکشێتەوە.

– شتێکیش بەجێ دێڵێ.

– تۆ کیژێکی زیرەکی، من زۆر حەز لە زیرەکیی ئافرەت دەکەم. کەواتا خوێندنەکەت لە پۆلی پێنج بەولاوە تێ نەپەڕاند.

– باری ژیان و گوزەرانەکەم وای ویست گەورەم. دایکم تووشی نەخۆشیی پشــووســـواری بووبوو. زۆر بەئێش و ئازارەوەی دەگــرت. باوکم ناچار بوو. یەکێکمان بکا بەمامۆستای قوتابخانە، یا من، یا ئامینەی خوشکە چکۆڵەم.

– تۆیش وات پەسند کرد، خوشکەکەت ببێ بەفێرکار.

– بەڵێ وام پەسند کرد، گەورەم. پیاوی تاین بەتووڕەیییەوە زاری لێک نا و یەکراست ئارەوانە کورسییەکەی بنی بەرەو دەرکە ڕادا.

ڕووناکی، ئەم جارە بەتیشک و ئاورینگەوە دەهاتە ژووری.

– هەر دەڵێی پەپوولەیە. ڕووناکی تا بەتیشکتر بێ، وایە.

– چونکە ڕووناکی هەرچییـەکمـان واز لێ بێ دەمـانداتێ، گـەورەم، بەش بەحاڵی من، خۆ هەر هیچ نەبێ شەبەنگ و تارماییم لێ دوور دەخاتەوە.

– شەبەنگ و تارمایی؟

– لە ڕووناکی هەڵدێن، بەڵام کـــە دەنووم، چرا نـەکـــوژێنمــــەوە، هەست بەناڕەحەتی دەکەم.

– ئەمنیش هەر وەک تۆم، بەڵام من لەبەر ئەو باری ژیانەی تێیدام پێویستیم بەڕووناکی هەیە. دەڵێی چی پەردەکان بەڕەنگێکی جوانتر بگۆڕین؟

– مـەیلی جەنابتـە، گەورەم. ڕەنگێ هەڵدەبژێرم، لە دادانەوەدا، بەر ڕووناکی زۆر نەگرێ.

– چۆن دەڵێی، با وا بێ.

– تۆیش لەو ماوەیەدا، کە من لە پەردەی تازە دەگەڕێم.

– دەتوانم چاوەڕێ بکەم. لەگەڵ ئەوەیشدا، چاک وایە، کە دەچیە دەرێ، ژنی باخـەوانەکە ئاگـادارکەی، لێم نزیک بێ. نازانم بە چاکی ناسیت؟ ئەگـەرچی ناوەناوەیش وشـک و مـۆنە، ئەوە لەبـەر هەندێکەیە، هەر لـە سـەرەتای ژیانـیـەوە زۆری تاڵاو کێشاوە. مێردەکەی بیست ساڵ لە خۆی گەورەتر بوو. پاسەوانی دار و دەستەکی ئەم خانووە بوو کە بناخەمان لێ دا. کە لە خانووەکە بووینەوە کردمان بە باخەوان.

– هەر ئەوها.

– بەڵێ ئەوها، بەم جۆرە ئەو ژوورەی لەگەڵ هەردوو ژووره چکۆڵەکانیدا بۆ خۆی دروست کرد و لە پێشان ویستی بیکا بەزنجێ، پاشان بەگوێی کردم، ئەو ژوورەی لێ بنیات نا کە دەبینی. ئەنجا چاوەخانێکی دیکەشی بۆ منداڵەکانی لێ زێدەکرد. هەقی بوو. منداڵەکان لە خەم ڕەخسیبوون.

– ژنەکە خراپ نەبوو، گەورەم.

– خراپ نەبوو، بەڵام کوڵۆڵی کە شەقڵ و مۆرەی خۆی بەدڵ و دەروونی کەسێکەوە نا، تا مردن کوێر نابێتەوە.

شەرمین دە ڕۆژێ دەبوو، خزمەتی پیاوە ئیفلیجەکەی دەکرد. بەرەبەرە لەگەڵ ژیانەکە ڕاهات، تاوناتاوێ هەلی بۆ هەڵکەوتبا سەرێکی ژنە باخەوانەکەی دەدا، لەوسەری باخەکەوە لێی دادەنیشتن، دەستیان بەقسان دەکرد. باخەوانەکەیش چ ئیش و کاری نەدەکرد، لەولاوە هەر خەریکی ئەوە بوو پەیتا پەیتا مژ لە کۆنە قەنەکەی بدا و دووکەڵ بە با دا. جارجارێکێش بە داخەوە سەیری دار و درەختەکانی دەکرد و زۆری حەیف لێ دەهاتن، کە ئەو بەنەمامیی ناشتن و ئێستا وا گەورەبوون، کەسێ نییە کەزاخیان کا. خاوەن ماڵیش لەوەتی لە پێ کەوتبوو، دەستی نەدەگەیشتنێ.

ژووری پیاوە، پان و بەرین بوو. پڕ فەرش و ڕایەخ بوو. کتێبخانەکەی وا دانابوو، کورسییە چەرخدارەکەی بەرەو خەو گایێ ڕادەدا و ڕادەکشا، بەسانایی دەیتوانی کتێبی لێ دەرێنێ. کتێبەکان زۆر بەدانسقە ریز کرابوون. هەموو هەلاوێردەی دەستی خۆی بوون. دەرکەی ئاودەست و سەرشۆرکە هەراوەکە بەلای دەستە ڕاستیەوە بوو. ژوورەکەی شەرمینیش ڕێک بەتەک ژووری پیاوەکەوە بوو. ئەویش وەک ژووری پیاوەکە پڕ فەرش و ڕایەخی چاک بوو. لە چیی کەم نەبوو. رەنگێ لە نێوان هەردوو ژوورەکەدا هەبوو، پیاوە هەر کاتێ پێویستی بە شتێ هەبا، لە زەنگی دەدا. کیژەیش ئەمەی، تەنانەت لە خرپەی خەویشدا با، لەبەر گران نەبوو.

– ئەمڕۆکە زۆر دڵخۆشی، شەرمین؟

– ئەی چۆن، گەورەم. ئەمڕۆ نامەیەکم لە خوشکەکەمەوە وەرگرت.

– دیارە خەبەری خۆشی تێدایە.

– زۆریش گەورەم. شوکور ئەمساڵ دەرچوونەکەیشی دەردەستە. ئاواتەکەی باوکم بەجێ دەهێنێ. کیژە وەرزێرێ لەو ناوچەیە دەبێ بەمامۆستای قوتابخانە.

– ئای لەو خەبەرە خۆشە. ئیتر چیی تر؟

– باشە، دەرکەی ژیانێکی خۆشتری لێ دەکرێتەوە.

– ئەی تۆ؟

– ئەی بێ بەڵا بی. گوایە ئەم هەموو خێر و خۆشییەی تێیدام، بەس نییە.

– تۆ کچی چاکی. شەرمین. من پێنج مانگ لەمەوپێش زانیم. تۆ کچی وا چاکی. هیچ نەگۆڕاوی.

– شتی خۆڕسک پتر دەمێنێ، گەورەم.

– ئەوە دەزانم، شەرمین، بەڵام تەنانەت شتی خۆڕسکیش زۆر جار لە ژێر باری ناچاریدا ڕێڕەوی خۆی دەگۆڕێ. ئەتۆ هەموو جارێ، ئەتۆ هەمیشە دەڵێی ئەمن کیژە گوندییەکم، چاکە بەبیرت نایە، جۆگەلەی چکۆڵەچکۆڵە مل لە گابەردان دەنێن، چ دەکەن؟

– پێچ دەکەنەوە، پێچ دەکەنەوە، زێتر پێچ دەکەنەوە.

– تا ڕێڕەوی خۆیان دەدۆزنەوە و دەتوانن پێیدا برۆن، ڕێژەویش لە ژێر باری ناچاریدا دەگۆڕێ. تۆ هەروا ئەوەی بەشێکە لە لەشمان و ئەندامی هەرە نزیکمان بەنموونە بێنەوە.

لە ڕووداوی کوتوپڕدا وا دەبێ یەکێ لووتی دەبڕدرێ، ئەتۆ خەڵکی بێ لووتت دیون، لووتی وات دیوە نەکۆمابێتەوە، من ئەندازیاری میعماری بووم، شەرمین. زۆر لەوانەم دیون.

– هێندێ جار، کار، هەرە شتی پێداویستم لە دەست دەدا.

– بەم زووانە وەڵامی خوشکت دەدەیەوە؟

– هەر ئەو شەوەکە، گەورەم.

– دە ئەو کلیلە بەرە، ئەو قاسەیە بکەوە. دەسەوارەیەک پارەی لێ دەرێنە.
دەسەوارە پارەکەی دەرێنا، لە پێشێی دانا.

پیاوەکە سێیەکێکی لێ دەرکێشا، گوتی:

– ئەمەی بەموژدانە بۆ بنێرە.

شەرمین دەسەوارەکەی لێ وەرگرت. یەک، دوو، سێ، چوار، دەستی بەژماردن کرد.

– ئەمە ئێکجار زۆرە. بەشیاوی نازانم هەمووی وەرگرم. بێ لەوەیش من بەپارە خزمەتت دەکەم. ئەوەی دەیکەم مزی لەبری وەردەگرم.

– ئەمە بۆ تۆیە، شەرمین. بەختت وای هێنا، ئەوەندە پارەیەت بەدەستەوە هات.

– بەڵام...

– شتێکی بنەبڕ، بڕیارم لەسەر دا، حەزناکەم کێشەی لەسەر بکرێ و چەند و چۆنی تێدابێ. ئەوە چەندساڵیشە، لەسەر بڕیارێکی دابێتم، کەس هەڵی نەداوەتێ.

– سوپاس گەورەم. ئەتۆ منت کرد بەشتێکی بەنرخ. ترس و دێوەزمەم لە کۆڵ بووەوە.

– ئەوە لەبەر هەندێکەیە، کە تەواو پشتت بەژیان بەست و لەنگەری خۆت گرت. ژیان هەرچەند نالەبار و ناخۆشیش بێ مرۆ ناچارە، دەبێ بەسەری ببا. چەند لەو پارەیە بۆ خوشکت دەنێری؟

– شتێکی کەم، گەورەم.

– باشە، ئەوی دەمێنێتەوە بۆ خۆت.

– بەڵێ، گەورەم، ئەگەر زۆری بۆ بنێرم، ڕەنگە لێم بەگومان بکەوێ و بیری خراپ بکاتەوە، لە دڵی خۆیدا بڵێ، داخوا ئەم هەموو پارەیەی لە کوێ هێنابێ، وا مووچەیەکی کەمی بوو و نەبوو.

– تۆ زیرەکی.

– لەوانی دەگەڵیان دەژیم، فێردەبم، جەنابت بەو چەند مانگە بیر و هۆش و ڕۆحت بەزۆر شت پارا و کردمەوە. زۆرت پێ بەختەوەرم، گەورەم. ویستم بپرسم؟

– بۆ ناپرسی، کێ ڕێی لێ گرتووی؟ سەربەستیی تەواوم داویتێ. لە سنووری شتی بەجێدا هەموو شتێ بڵێ و بپرسە و بخوازە.

– لەوەتی لەم بەهەشتەی ژێر سێبەرەی تۆدا نیشتوومەوە، هەموو شتێکم بەگوێرەی زەوق ڕێک خست، هۆڵە گەورەکە، ژووری نانخواردن، مێزی بلیاردەکە، بەڵام ژوورە درێژەکەی بەسەر باخچەکەدا دەڕوانێ، هەر وەک خۆی چۆن، پێوە دراوە، هەروا پێوە دراوە، ئەی ئەویش نەختێ پێویستیی بەڕێکخستن نییە؟

– بێگومان. بەڵام ئەمە کردەنی نییە و ناکرێ.

– لێم مەگرە، بۆچی گوایە؟

– چونکە کارێکی زەحمەتە. نەک هەر کچێ، یا ژنێ، دە کچ و ژنیش پێوە ماندوو دەبێ.

– گوایە ئەوەندە داغان و ناڕێکوپێکە؟

– زۆر، لەوەیش خراتر.

– بێ زەحمەت دەتوانم کلیلەکەی وەرگرم؟

– دەبێ حەوتووێکی تەواو پێوە بگلێی.

– جا لەوە هاسانتر هەیە، گەورەم، بەڵام یانی چی وا بەو ڕەنگە پشتگوێ خراوە؟

– چونکە ژووری هونەرمەندێکە، ژووری ئەو کوڕەیە، نەختێ لەمەوپێش باسم بۆ کردی. زۆرم پێ ناخۆشە لەگەڵم ناژی، کە سەرێکیشم لێ دەدا زۆر نامێنێتەوە.

– لە دوور دەژی.

– لە جێگەیێ کە هەرگیز بەبیرتدا نایە. ئەویش سەبارەت بەدایکی، کە هەر لە منداڵییەوە کەوتبووە سەر کەڵکەڵەی ئەوە، کوڕەکەی هونەرمەندە و بە بەهرەیە. ڕۆژێ دێ کاری هونەرمەندانەی لە دنیابەدەری وای لێ دەوەشێتەوە مەپرسە. دایکەکەی ئەم خولیایەی لە مێشکیدا چەسپاند.

– جا بەڕاستی هەر خولیا و کەڵکەڵە بوو و چیی تر؟

– شتێکی ڕاستی تێدایە. دایکی خاوەن بەهرە بوو لە نیگارکێشیدا، بەڵام ژیانی خۆش و کەش و فش و هەیت و هووت و بەدەبدەبەی سەروەت، بەهرەگیریی لێ ساندەوە و ئەو ئەرکەی لە ئەستۆی کوڕە تاقانەکەی، دوابەش و کەرەمەکەی خوا، خست... هەرچییەکی لە کەس و کاری بەمیرات بۆ مابووەوە، بۆ کوڕەی بەجێ هێشت و ئیدی خەمی دەستکورتی و هەژاریی دوارۆژی لە مل کەوت.

کاتێ فرۆکەکە بەربووەوە و دایکە لە فرۆکەخانەیەک لە فرۆکەخانەکانی ئەوروپا مرد، کوڕی بەسزمان بۆ خۆی تووشی مێشک هەژان بوو و منیش ئاوا وەک دەبینی، بۆ خۆم مجرۆ بووم و هیچ بژیشکێ چاری نەکردم.

ئینجا کوڕە بنە و بارگەی بۆ پێچایەوە، لێی دا ڕۆیشت. گوتی ئەو بارە هونەرییەی دایکی لە ئەستۆی خستبووە دەبێ بەجێی بهێنێ. دەبێ ببێ بە هونەرمەندێکی گەورە و بەناوبانگی وا مەگەر هەر لە یادگاری دایکی بوەشێتەوە. شار بەشار گەڕا، ئەم وڵاتی کرد، ئەو وڵاتی کرد، وەک بۆ خۆی دەیگوت، لە سرشتێکی ڕاستەقانی دەگەڕا، کارێکی هێندە گەورەی لێ هەڵازنێ هەتا هەتایە مێژوو پەسنی بدا.

– نامەشت بۆ دەنووسێ؟

– جارجارە کارتێکم بەماچێکەوە بۆ دەنێرێ، بەوەدا دەزانم هەر ماوە و بەرخوردارە.

– کەواتا پێویستە ژوورەکەی بۆ ڕێک خەم، بەشکو هاتەوە.

– هاکا هاتەوە. هەربینا بەسەریدا داین و گەڕایەوە، ئەو ژوورەیش وەنەبێ هەر ژووری نووستنی بێ و بەس، ژووری نیگارکێشیشێتی، بیبینی هەروا سەرت سوڕدەمێنێ، لە لایێ بۆیە و تابلۆ و داو و دەرمانە، لە لایێ نەخشەی تابلۆی وایە بۆ تەواوکردن دەست نادا.

– جا لەبەر هەندێ، زۆر حەزدەکەم ئەو ژوورە ببینم و ئەوەندی پێویستە لەگەڵی خەریک بم. لێشتەوە دوور نابم.

– چاکە.

دەستی لەبن بالیفەکەی ڕاکرد، ئاڵقەیەکی دەرێنا، تاکە کلیلێکی پێوە بوو، گوتی:

– ئەوە کلیلەکەیە بەڵام هەقی ئەوەت نییە هیچ لە جێی خۆی بگۆڕی. کارەکە وردە و بیری تیژی دەوێ. وا چاکە لە سبەینێڕا دەست پێ بکەی.

شەرمین کلیلەکەی لە بەریکی هاویشت، ئەوجا پاش ئەوەی پیاوەکە کورسییە چەرخدارەکەی لە پاین تەختەکەوەی بەجێ هێشت و لە سەر جێگەکەی ڕاکشا، شەرمین چووەوە ژوورەکەی خۆی.

کلیلەکە هەر کە جاری دووەم خولێکی خوارد و نەخوارد، شەرمین بەئەسپاییەکەوە پاڵی بەدەرکەوەنا، سەیرێکی نێو ژوورەکەی کرد.

پەردەکان بەسەر هەر هەشت پەنجەرەکاندا دادرابوونەوە. تاریکاییی شەمەکی نێو ژوورەکەی وا شاردبووەوە، لە ناسینەوە نەدەهاتن، پڕی دانێ یەکە یەکە پەردەکانی هەڵدایەوە. نەختێکیش زەحمەتی پێوە کێشا. پەردەکان بەیەکەوە گرێ درابوون و تەواو پێکەوە چەسپێندرابوون.

ڕووناکیی ڕۆژ لە پەنجەرانڕا فیچقەی کرد و ڕەنگ و ڕووی هەموو شتێ ئاشکرا بوو، ژوورەکە ژوورێکی خواساییی نەختێ درێژووکە بوو. بەو نەختە

درێژییەی وەک داڵانێ دەچوو. ئەو شمەکانەی تێیدا بوون، هەمە جۆر بوون. هەریەکە لە بابەتێ بوون. لە ژوور نەدەچوو. هەر دەتگوت کوتومت ئەشکەوتی جرِوجانەوەر و شتی سەیر و سەمەرەیە.

چەند سێپایەکی نیگارکێشیی تێدابوون، هەندێکیان نیگاری شتی وابوون پیاویان بەپێکەنین دێنا. سەر زەوییەکە، سەر مێزە درێژەکە پرِ بوو لە فرچە و رِەنگ و بۆیە و قەڵەم و پەرِەکاغەزی شرِوهورِی لەسەریەک کەڵەکەکراو.

کەواتا ئەمەیە نەخش و نیگار. پیاوە رِای سپاردبوو، دەست لە هیچ نەدا و هیچ لە جێی خۆی رِانەگوێزێت. وا دیارە ئەم پیاوە دەزانێ چی کورِە توورِە دەکا و چیی پێ خۆشە و چیی پێ ناخۆشە، ئەو هەر هێندەی لەسەرە تۆز و گەردی شمەکەکان داتەکێنێ. تۆز و گەرد نەبوو، هەرچی هەبوو نەبوو لەو ژوورەدا، بە بار لێی نیشتبوو. ئەوجا با زەوییەکە بماڵێ و پەردەکان داتەکێنێ. ئیدی دەستی بەکار کرد.

دەیویست زوو لێ بێتەوە. نەدەکرا ئاغا ئیفلیجەکەی بەجێ بێڵێ. تەنیا بوو. کارەکە زۆری نەبرد. هەر لەگەڵ لێ بووەوە و لێ نەبووەوە تەماشای کرد دەرکێکی نیوە بەتاک لەوسەری ژوورەکەوە دیارە. لەوێوە چووە ژوورەرە، نوارِی تەختێکی بەرین داندراوە، خوێن و پێخەوێکی نەرم و نیانی لەسەرە. پەنجەرەیەکیش بەسەر باخچە گەورە پشتگوێ خراوەکەدا دەرِوانێ.

– کەواتا ئەمە ژووری نووستنەکەیەتی.

رِادیۆیەک، رِێکۆردەرێک، چەند کتێب و وێنە و نیگار و پەروازێکی نەخش لەسەر هەڵکەندراو و دەفرێکی بلووری، کە هێندێ توێکڵی میوەی کۆنی پێوە لکابوو، لەسەر مێزێکی خنجیلانە داندرابوون.

پەتۆیەکی ئەستووری خوریش لە پاین تەختەکەوە کەوتبوو، لەوە دەچوو ئەوی لەوێ نووستبێ، لەپرِ لەخەو رِاچەنیبێ، شەقێکی لە پێخەوەکان هەڵدابێ، پەتۆکە کەوتبێتە خوارێ. هەر لەخۆرِا وەک بڵێی بەزەی بەخاوەن ژوورەکەدا هاتەوە. خۆ وەنەبێ بیشیناسێ، بەڵام بەو رِەنگەی ئەو وا خەمناکانەی بیر لێ

کـردبووەوە، دیارە بەزەی بۆ دەبزووت. هـەرچی چەرچەفی سـەر تەخـتـەکـەیش بوو، وەک ناوەندی بالیفە شینەکەی سەری چڵکن بوو.

خـۆی بەخـاوێنکردنەوە و خـرکـردنـەوەی ئەم ژوورەوە زێتـر مـاندوو کـرد. هێندەی ڕێکوپێک خرکردەوە، دەتگوت وەتاغی ئوتێلی گـرانبایییـە. شـەرمین هەر لە نەخۆشخانەڕا فێرە خزمەتێکی زۆر بووبوو.

تۆێکڵـە میوەکانی خرکردەوە، چەرچەف و بەرگە بالیفەکەی لەگەڵ تویێکڵـە مـیـوەکاندا هـەڵگرت، لە ژوورەکە وەدەرکەوت. کارەکانی هـەمـوو، بەدڵی خۆی جێبەجێ کرد. لە هاتنەدەرەوەدا بوو، دەرکەیەکی داخراوی بەرچاو کەوت.

دەسـتـێکی پێـوە نا، نـەخـتـێ بەزەحـمـەت کـرایەوە. تەمـاشـای کـرد سـەرشـۆرکـێکی پان و بـەرینی تێـدایە، لەبەر ڕووناکـیی پەنجـەرەکـە هـێندێ ئامـێری کارەبـاییی چا لێنان و چێـشت لێنان و سـۆپای کارەبـایی دیاربوون. سـەرشـۆرکـەکـە ئاودەسـتـخـانەی تێـدابوو، بانیـۆیـەکی پەمـەییی تێـدا بوو. ڕەفـەیەکی خنجـیـلانـەی شـووشـە بەدیوارەکـەوە بوو، تاخـمی ڕیش تاشـین و شووشە کۆڵۆنیا و ئەو جۆرە شتانەی بەسەرەوە بوون.

کەواتا ئێروکانە جێگەی هەموو شـتێکن، جێگەی کارە، وەتاغی نووسـتنە، ئاودەستـە، سەرشۆرکە، هەرچی پێداویستیی ئینسانێکی شارستانیی سەڵت و قوڵت، قاچاخ، لێقەوماو هەیە. تێدایە.

پیاوەکە تەواو وەڕەز بووبوو، گوتی.

– ئەوە گـەڕایتـەوە، سـەر و ڕووت بەجـارێ تۆزاوی بووە. دەمـزانی زۆر پێـوە ماندوو دەبی. ئەوە چییە پێت؟

– چەرچەف و بـەرگـە بالیـفـەکـەیە گـەورەم، زۆر چڵکن. خـۆ دەبینـی چەند چڵکن. گـوتم بەشـکو یـەک دوو ئاراوێکیـان بگرمــەوە. بیـانشــۆم. دالان و ژوورەکەم وا خاوێن کردەوە، هەر بۆ ئەوە دەشێ کیژە میرێکی لێ دانیشێ.

– یا میرێ.

– بەڵێ ئێستا زۆر لەبارە بۆ میرێ.

– ئەگەر هات و میرەکەیش هونەرمەند بوو. چی زێتر سەرنجی ڕاکێشای لە نێو ئەو هەموو تابلۆ و نیگارانەدا شەرمین؟

– سینگ و مەمک گەورەم. بمبەخشە.

– سینگ و مەمکی چی؟ تێ ناگەم.

– سێیەکی تابلۆ و سکێچەکان سینگ و مەمکی چکۆڵە چکۆڵەن. چەند جارێ وەخت بوو زەندەقم بچێ کە سینگ و مەمکی ڕووتی بێ سەرم دیت. وا دیارە، لە لەش و لاری ئافرەتدا، لەو بەشەی پتر بەتەنگ چیی دیبەوەی نەهاتووە. بمبەخشە. خۆت لێت پرسیم، بۆیە بەو ڕاشکاوییەم وەڵام دایەوە.

– لە شتێکت بەئاگا هێنام، لێی بێ ئاگا بووم. لە مێژە نەچوومەتە ژوورەوە، بزانم چیی تێدایە.

کابرا هەناسەیەکی ساردی هەڵکێشا:

– دایکی سینگ و مەمکێکی ئاوەدانی هەبوو، هێشتا تەمەنی چڵ ساڵ بوو، کەچی لە ئێستای تۆ دەچوو.

– منداڵی چاک و لەبار دایک و باوکی خۆیان خۆش دەوێ.

– منی زۆر بەدڵ بوو، شەرمین، بەڵام دایکی زۆر خۆش دەویست. هەموو خۆشەویستییەکەی بەر دایکی کەوتبوو.

– هێندێ کوڕ هەر بەمنداڵی دەمێننەوە.

– کە یەکێکیان بۆ بڕەخسێ بەسینگ و مەمکی پڕ شیر و خۆشەویستی و گەرم و گوڕی گۆشیان کا، ئەو گەرم و گوڕییەی بۆ ئەوان لە شیر بە بەهاترە. دەبڕۆ دەی، پێویستم بەهیچ نییە.

ئێوارە چەرچەفەکە و بەرگە بالیفەکە هیشک بوونەوە، چووە ژوورەوە بۆ ناو دیوەخانە چۆڵەکە.

هێشتا ڕۆژگار نووزەیەکی تێدا مابوو. دنیا زۆر تاریک نەبوو. وێڕای ئەوەش وای بەچاک زانی چراکە هەڵکا.

ڕووناکیی گەش لە هەموو لایەکەوە دەرپەڕی، شوێنەکەی پڕ کرد، ئەو ناوە سامێکی ڕۆحانیی تێ گەڕا. دەتگوت خاوەنەکەی لە جێگەیەکی دوورەوە بەسەریدا دەڕوانێ.

لەسەرەخۆ چوو، پەردەکانی هەڵکشاند، هێندەی دیکە کپی ئەو ناوەی داگرت. ئەوجا لەپاش ئەوەی چەرخەکەی بەسەر دۆشەکەکەدا دادایەوە و بالینەکەی لە بەرگە خاوێنەکەی هەڵکێشایەوە، پشوویەکی ڕەحەتیی دا.

نەیزانی بە چ نیازێکەوە لەسەر جێگەکە ڕاکشا و سەری لەسەر سەرینە نەرم و نیانەکە دانا. قەدەرێ بەپەشۆکاوییەوە خەیاڵی خۆشکەڵە خۆشکەڵە بردییەوە. دەم و چاوی بەگەواڵەیێ قژی سووری هەڵگڕاو داپۆشی. سەرلەنوێ نوقمی نێو خەون و خەیاڵ بووەوە.

– تابلۆیەکم، لەوانەی سینگ و مەمکیان تێدا نیگارکێشاوە، بۆ بێنی. لەبەر ڕووناکییەکە هەرە چاکیان هەڵاوێرە.

پیاوە لەسەر جێگەکەی تەواو کەشەنگ و خەمناک دیاربوو.

بەوردی چاوێکی بەتابلۆکەدا گێڕا.

– کەم و کورتیی نییە، شەرمین. لە ڕووی هونەرەوە زۆر تەواوە.

– بەڵام نازانم بۆ سەری پێوە نییە؟

– سەر، بەدەم و چاوەوەیە، ڕەنگە نەیویستبێ دەم و چاوی ئاشکرا کا. ڕەنگە هەر لەبەر ڕێز لێگرتن و قەدرزانینی خاوەنەکەی بووبێ.

ئاخێکی هەڵکێشا، وەک بگریێ، گوتی.

– کێ دەزانێ. نازکێشان و بەناز و نووز بەخێوکردن نەخۆشیی سەیر سەیری لێ دەکەوێتەوە.

کە زانی شەرمین ڕەنگە لەو ئیشارەتە تێ نەگەیشتبێ گوتی:

– ڕەنگە سینگ و مەمکی دایکی بەدڵەوە چووبێ. زۆر دەچووە ژوورەکەی، بەسەعات لەوێ دەمایەوە، هەڵە و کەم و کوڕییەکانی پێ چا دەکرد. دەیگوت، ئەمە هەڵەیە، ئەوە وا دەبێ، ئەمە وا...

– بەڕاستی دایکی چاک بووە وا دیارە گەورەم.

– خوا لێی خۆش بێ. کە زۆر لە ژوورەوە دەمایەوە دەمپرسی:

– ئەوە چییە، خۆ کوڕەکە منداڵۆچکە نییە. ئەویش دەیگوت:

– بەڵێ هێشتا لە نیگارکێشاندا منداڵێکە و گاگۆڵکێ دەکا، وازی لێ ناهێنم تا وەسەر پێ دەکەوێ. کە پێرۆکە و وەروێڕکە بوو هەنگێ لە خەم دەڕەخسێ.

ئەتۆ پێت وایە چییە، شەرمین؟ خۆ تۆ کیژێکی زیرەکی؟

– مەبەستت چییە گەورەم؟

– ئەو پێوەندییە کرژ و ئاڵۆزەی دایک؟

– ئەدی هەموو دایکێ وا نییە، گەورەم؟

– نەخێر، ئەو دایکێکی جیاواز بوو. دایکێکی تایبەت بوو. لەو بڕوایەدام، کە زۆر جار لە ژوورەکەیدا دەمایەوە.

شەرمین مچوڕکێکی بەلەشدا هات، دەتگوت لە گۆماوێکی شەختەبەندیان هاویشت بەڕووتی، ئاگای لە خۆی نەبوو، قیژاندی:

– شتی وا چۆن دەبێ، شتی وا ناشێ و ناکرێ گەورەم، قەت نابێ.

– چی نابێ شەرمین؟ ئەگەر دایکەکە جۆرێکی تایبەت بێ، سەیر و سەمەرەییی لە چدایە، پێی خراپ نەبووە لەبەردەم کوڕەکەیدا وەک مۆدێل بوەستێ.

– ئەیەڕۆ، بەسینگ و مەمکی ڕووتەوە. هەر هیچ هیچی لەبەردا نەبێ.

– ڕەنگە. ئەی تۆ هیچ تابلۆی بەناوبانگی وات نەدیون، نیگارکێشەکانیان دایک و خوشکی خۆیان بەڕووت و قووتی نیگارکێشابن. ئەوەی لە جیهانی هەڵکەوتدا سەیر و سەمەرەیە لە جیهانی واندا شتێکی دیکەیە. جیهانەکەی ئێمە سروشت، جیهانی سروشتە. ژیانیش دەرەتانێکە بەو، ڕووبەڕووی سروشت و پێداویستییەکانمان دێین. هەرچی ئەوانن خۆیان جیهان بۆ خۆیان

دەگوورێن. جا لەبەر ئەوەی کە ئەو جیهانانە بەهای نوێباویان پێویستە، زۆر جار بەئاکار و ڕەفتارێکی پیرۆزیان دەزانین، تخوب دەبەزێن و کەلێنیان تێ دەخەن.

– گوتت لاچاوخانەکە ئامادەیە؟

– بەڵێ گەورەم. ئامادە و تەیارە.

– چاکە، ڕەنگە بەمزووانە بگەڕێتەوە. بەو کارتەیدا لەم دواییەدا ناردوویە، ڕوونە. لە ئیسپانیاوەی ناردووە.

– پەتۆیەکی دیکەت پێمدا دابا. وا هەست دەکەم ئەمشەو سارد بێ.

– ڕاست دەفەرمووی، گەورەم. سۆپاکە هەڵکەم.

– هێشتا ناو ژوورەکە لەبارە بۆ من، بەڵام چاتر وایە هەموو پەردەکان دادەیەوە.

کە لە دادانەوەی هەموو پەردەکان بووەوە پەتۆیەکی دیکەی پێدا دا و هەروا، زۆر دوور نا، لە بەردەمیدا دانیشت.

– ڕەنگە ئەمشەو بێتەوە.

– خوا دەزانێ.

– هێندێ جار سۆسەی شتێ دەکەی، لە حەوت ئیقلیمەوە بێ، دڵت خەبەر دەدا. وا بزانم ئەمشەو لەوانەیە بگەڕێتەوە.

– دیارە زۆری بەتاسەوەی، هەقیشتە.

– سوپاست دەکەم. ژوورەکانت بۆ ئامادە کرد. بەڕاستی لاوێکە شیاوی بەتەنگەوەهاتنە. وەسیەتێکی تاڵم لە دایکیەوە بۆ هەڵگرتووە.

دەستی درێژ کرد، کلیلی قاسەکەی دەرێنا، گوتی:

– قاسەکە بکەوە، لە چینی خوارەوە قوتوویێ چکۆڵەی ئاسن هەیە.

قوتووەکەی هێنا بەکلیلێکی چکۆلانە کردییەوە.

– دەتەوێ چاوێکی پێدا بگێڕی، شەرمین؟ من جارجار شتی وا دەکەم،

بیرەوەری زۆر بەهێزە، هێزی لە کێشدا نییە. شەرمین نوارِییە نێو قوتووەکە.

– هەرچییەکی تێدایە دەچریسکێتەوە، گەورەم.

– خشڵ و زێرِەکانیەتی. ئەوانەی بەمیرات بۆ ماونەوە ئەمانە ئەو شتانەن کە لە گەشت و گەرِانی ئەوروپایدا بۆی ماونەوە و کرِیونی.

باری ئەم میراتییە بەکۆڵی منەوەیە. وەسیەتی بۆ کردم ئەمانە هەموویان بدەم بە بووکەکەی، بە ژنەکەی عەدنانی کورِی، هەر جارێکی بەسەفەر دەچوو ئەم وەسیەتەی لێ دووپات دەکردمەوە. دوا جاری ئەوەبوو کە لە فرِۆکە کەوتە خوار و بەسووتاوی مرد.

پیاوە قوتووەکەی داخستەوە و کلیلی دایەوە، گوتی:

– ئەوجا لە جێگەکەی خۆی دانێوە. سوپاست دەکەم.

– دڵم بەو کارەت خۆش بوو. ئای بۆ ئێمەی سووکەڵەی شل و شاو کە دڵمان بەم بەردانە خۆش دەبێ.

شەرمین کلیلی قاسەکەی بۆ گەرِاندەوە، چووەوە سەر کوسییەکەی بەرانبەری دانیشتەوە.

– ئەگەر ئەم کورِە بەداوێکەوە بوایە، حەزی لە ژنێ کردبا و هانیبای ئەمنیش، ئەم بارەم لە کۆڵ دەبووەوە.

– ئەی ئەگەر بەداوەوە نەبوو؟

– نەبوو؟ منیش، ئەمجارە ئەگەر هاتەوە، میراتییەکانی دایکی دەدەمێ دەڵێم بیانبا بۆ بانقێ لەوێی بخەوێنێ، تا ژن دێنێ. کە ژنی هێنا بیانکا بەدیاریی دەستی بۆ ژنەکەی. دەترسم بمرم، ئەم شتانە دەست ئەو دوو چەتیوە چاوقایمانە بکەون، بێ بەشی کەن. بۆ خۆت دەزانی ئەمانە خەڵاتی شەخسین و بەتایبەت هی ئەون.

– پەککو لەو دایکە چاکە.

– لەو ژنە چاکە. پیاو لە کاری خوا سەری سورِدەمێنێ. نازانم بۆچی خوا لەم بابەتە جوانە، لە هەموو شتێکدا، زۆر دروست ناکا؟ لە دەم و چاودا لە

سینگ و مەمکدا، لە زیرەکی و ئاوەزدا.

– وا بارانیش دەستی پێ کرد.

– کە داوای پەتۆیەکی دیکەم کرد هەستم کرد دەبارێ. سوپاست دەکەم.

شەرمین هەستا نوێنی دیکەی بەسەردا دا. چراکەی کوژاندەوە. چرایەکی چکۆڵەی هێشتەوە. چووەوە بۆ ژوورەکەی خۆی.

– بارانەکە تەواو خۆشی کرد. ئەمڕۆ تنوکێ نەباری. ئەوەتا ڕۆژیش وا هەڵات و سامالێکی خۆشە، گەواڵە هەورێ چییە بەئاسمانەوە نییە. حەزدەکەی با کورسییەکەت بۆ باژۆمە نێو باخچەکە.

– نا، حەز دەکەم هەر وا لێرە بمێنمەوە. حەوتوویەکی خشتە بارانە، دنیا هەموو تەڕ و تووشییە.

– ڕاست دەفەرمووی.

– سۆپا کارەباییەکە هەڵکە، ئافەرین پیشەسازی، هونەر زۆر شتی هێنایە گۆڕێ لە ژیاندا. ئەوەتا سۆپایان وەک ئاگردان دروست کردووە. کێ دەتوانێ بڵێ ئەو ئەسکڵانەی کاژێ مشکیان گرتووە، کوتومت ئەسکڵی ڕاستەقانی نین.

– گەرم و گوڕی و جوانی. ئای لەو خۆشییەی لە نرخ نایە.

– دەبێ ئەوە بەبڕواوە بزانین. جا لە خۆشەویستی بەولاوە هەیە بتوانێ ئەو دوو شتە بۆ مرۆ دابین بکا؟ گەرم و گوڕی و جوانی هەر خۆشەویستی دەتوانێ بیانبەخشێ.

– ئای کە ڕاست دەفەرمووی، لە گوند مانگایەکمان هەبوو، نەختێ لەمەوپێش بۆم گێڕایتەوە، عەیبەکەی هەر ئەوەبوو گوێرەکەی، بەمردوێتی دەبوو. جا چەند بەتوان و گوڕیش بوو، دەتگوت گای بنەیە. شیرێکی زۆری دەدا، پێی خەنی بووبووین، زۆرم خۆش دەویست، ڕەنگە ئەویش منی زۆر خۆش ویستبێ، چونکە هەر لەگەڵ دەستم دەدایە گوانی و نەدەدایە هەرچیی تێدا بوو، خۆش دایدەدایە نێو دەفرێ. زۆرم پێ جوان بوو، ژیکەلە بوو. لە

سەرلەبەری مانگای سەر دنیایێم بەجوانتر و ژیکەلانەتر دەزانی. بەڵێ ڕاست دەفەرمووی گەورەم، گەرم و گوڕی و جوانی هەر لە خۆشەویستی دەکەوێتەوە، تەنانەت کە شتێکت خۆش ویست با لە چاو یەکی دیکەشەوە جوان نەبێ بەڵام لە چاوی تۆوە جوانە.

پیاوە، ئەفسانەیەکی خۆشی، لەمەڕ خۆشەویستیی وڵاتی جندۆکان بۆ گێڕایەوە، زۆری خایاند، ئیدی شەوگار باروبنەی لێ خستبوو، چوارمێردەکی لەسەر تەختی پاتشایەتی ڕۆنیشتبوو.

– گوێت لێیە شەرمین؟

– لە چی گەورەم؟

– لە دەرکە دەدرێ.

– بزانم کێیە.

– ئاگات لە خۆ بێ، ڕێرەوەکە، چراکانی هەموو پێکە. هەر دەستێ بەدوگمەکەدا بنێ، هەموو پێ دەبن. ئەمن دۆست و برادەریشم زۆر نین، بەڵام دەشبێ بزانم.

– شەرمین دەرکەی کردەوە، ڕوانی لاوێکی کەڵەگەتی دارودەستە ناسک، بەجانتایەکی قورسەوە، ڕاوەستاوە دە بنیدا چرکەی دێ، پێشوازیی لێ کرد. ئۆتۆمبیلەکەی لە کن شۆستەکە وەستابوو. چوو، دەرگاکەی پێوە دا.

– بەداخەوە، وام زانی ماڵی خۆتانە... باوکت، زۆرت بەمەراقەوە بوو. دا دەی ئەو جانتایەم وێ دە، با یارییەت بدەم.

– نا، نا... جانتاکە پڕە، هەر بەوەدا ڕادەگەیشتم، بیکەمەوە، بیپشکنن. سەد جاریان پشکنی. هەرچی تێدایە تێک و لێکیان ناوە.

شەرمین بەخۆشی خۆشییەوە هەڕای کرد:

– خەبەرێکی خۆش گەورەم، مزگێنیم دەیێ.

– چاوەنۆڕی گەڕانەوەی بووم.

– ئەرێ وەڵڵا گەڕامەوە، باوە گیان.

– دە وێروەتر وەرە.

– باو و کوڕ بەگەرمەوە دەستیان لە ملی یەک کرد.

– ئەوە شەرمینە، کوڕم، بیناسە. شەرمینی کچی جوامێر عەبدوڵا. ئەوە چەند مانگێ دەبێ، ئەو چاوێریم دەکا. کیژێکی نەدیو و نەناسیو ئەوە دەکا، کەچی هەردوو خوشکەکانت کە لە خوێنی خۆمن، پیاوێکی کەنەفت و کەفتەکار پشتگوێ دەخەن. ئەوسا کە مردیشم، وەرە سەیری شەڕوشۆڕیان لەسەر میراتییەکەم. ئە لێرە، لەسەر لێواری تەختەکە دانیشە. بۆنێکت لێ دێ هەرگیز لە بیر ناکرێ.

– زۆر شەکەتم، باوە. ئۆتۆمبیلە لەحنەتییەکە پیاوی وەتەماحی خێرا ئاژۆتن دێخست. لە ڤییەننەوە دەیئاژۆم.

– ئەم سەرکێشییەت کارەساتێکت بەسەر دێنێ. تکات لێ دەکەم، تا بەسەر دنیاوەم بە خۆشت و بە منیشی نەکەی. بەڵێنی ئەوەم بدەیێ، ئاگات لە خۆ بێ، کەسی باوی.

هەر کە شەوێ بەترێکی چوو، شەرمین چاوی بۆ خەو شێلوو بوو.

– دەتوانی، بچی، بنووی بۆ خۆت. لەوانەیە ئێمە، تا بەرەبەیان دانیشین. ژوورەکەی ئەویش ئامادەیە.

ئاوڕی لە کوڕە دایەوە:

– شەرمین زۆری خۆ بەپاکژکردنەوە و ڕێکخستنی ژوور و شتەکانتەوە ماندوو کرد. تۆز و خۆڵ هەموو شتێکی داپۆشیبوو.

حەوتوویەکی پڕ لە خۆشی بەسەرچوو. هەرتک خوشک بەهەرسێ منداڵەوە هاتن، زۆریان دڵ بەدیاریی خاڵیان لە وڵاتی دوور گەڕاوە خۆش بوو. هەرچی کیژەکانی بوون بە تووڕەییەوە ڕۆیشتن.

– ئای لەو پیلانە کیژێکی وا شۆخ و شەنگ، بەو جوانی و دلارامییە دە خزمەت پیاوێکی گۆچی کەفتەکاردا. ئەمە هەمووی لە پای چی؟ ئەوا کوڕی

گەمژە، گرگرِ گەڕایەوە و سبەینێ دەکەوێتە داوی دڵدارییەوەی و هەرچییەکی لەو دایکە کەودەنە بۆ ماوەتەوە، لێ بەمیرات دەگرێ و ئاو بێنە و دەستت بشۆ.

– ڕاست دەکەی، منیش تێ گەیشتم، ئەتۆ تەماشای دەم و چاوی باوکمت کرد، کە بەزۆڵانە بەڕوویدا دەگرژێتەوە، چۆن دەگەشێتەوە، دیتت بەزەردە و بزەی شەیتانانە، لە خشتەی دەبا.

ئیدی، تا توانییان، دوور و درێژ، لە گەڕانەوەیاندا، گوتیان و ڕستیان.

– ئەمڕۆ ڕۆژەکەی زۆر خۆشە، کەسی باوی.

– ڕاست دەفەرمووی باوە، زۆر خۆشە.

شەرمین سینی و خوانی چاشتی پێچایەوە، گوتی:

– ڕۆژەکەی هێند خۆشە، هەر دەڵێی لە یەکێ لە ڕۆژە خۆشەکانی بەهارداین.

– حەز دەکەم.

– حەز لە چی دەکەی باوە؟

– ئۆتۆمبیلەکەت چۆنە؟

– زۆر ڕوخـتە و پتەوە، بابەتی دەشت و دەریشە و بۆ کەژ و کێوانیش لەبارە.

– دە کەواتا، ئارەزووێکی لەمێژینەم هەیە، بۆم بەدی بێنە، کەسی باوی، با نەیبەمە ژێر گڵەوە. حەز دەکەم بۆ ڕاوێم ببەی.

– خولیاکەت لێ نوێ بووەوەتەوە باوە گیان.

– دەمەوێ دەست و نیشان ئەنگاوتنی جارانم تاقی کەمەوە، چۆلەکەم لە ئاسمانێ دەپێکا، کێهە باڵندە بەبچووک دەزانی، بەئۆتۆمبیل ڕۆیشتنەوە، لە ئاسمانێم دەنگاوت.

– وەی بەسەرچاو، باوە گیان، جا چ لەوە ساناتر هەیە؟

پاش سەعاتێ پیاوە سواری ئۆتۆمبیل کرا. عەدنان هەردوو ساچمەزەنەکەی

لە پشت ئۆتۆمبیلەکە دانا.

– یاڵلا شەرمین تۆیش سوار بە.

– پێویست بە من دەکا؟

– ئەی چۆن. باوکم یەکێکی گەرەکە، بچێتە بن باڵی. ئەدی وە نییە؟

هەر هێندەی پێ نەچوو شار لە چاو ون بوو. باخ و باخات لەبەر چاو ون بوون، بوون بەڕەشاییەک وەک ڕەشاییی هەوری تۆز و خۆڵ. بەڕاست و چەپی ڕێگە قیرتاوەکەدا پێدەشتێکی کاکی بەکاکی، بێ سەروسنووری ڕووتەنی وەک چۆڵی قرفە بەدیارکەوت.

پیاوە هاراری کرد:

– بەڕاستدا، کوڕم.

– بۆ قەمیشەڵانەکە.

– ڕاوکەر، لە باڵندەیەکی ئاویی ئەوێ ناهومێد نابێ. لە دوورەوە ڕاستانێکی بەرین و بەدەرەتانی وەک ئاوێنە بەدیارکەوت، دەچریسکایەوە سێبەری قەمیشەڵانی دەوری گۆلاوێکی لە ئاوەزێی دوور پەیدا بووبوو، بەکەروێشکە کەوت. پیاو، وەک منداڵێکی تووشی یەکێکی بێ، زۆری بەتاسەوە بێ، شادمان بێ، قریواندی:

«ئای لەو باڵندە گەورەیە، وەپارێزی کەوە، کەسی باوی».

یەکەم ساچمەی ڕاوی دەرپەڕی و دەرنەپەڕی، دەمودەست باڵندەی پێکراو کەوتە خوار، لە دوور ئۆتۆمبیلەکە. کابرا چاوی پڕ بوو لە فرمێسک.

– دەست و نیشانپێکانم لە دەست نەداوە. ئەوەتا بۆ خۆت دەبینی، شەرمین، بەئۆتۆمبیل ڕۆیشتەوە، باڵدار بەو ئاسمانەوە دەپێکم. با وەدووی باڵندەکە کەوین. خەریکە دوور دەکەوێتەوە.

عەدنان خێرا دابەزی، چوو بۆ کن باڵدارەکە.

پیاوە گازی کرد:

ئەتۆیش شەرمین. وا دیارە برینەکەی هێندە کاری نییە. لە تەقەلای ژیانی خا.

شەرمین هەڕای کرد، پێش کوڕە کەوت، کوڕە دوو جاران کەوت. شەرمین کراسەکەی هەڵی پفاندبوو، هێندە جوان و شۆخ دەرکەوتبوو، هێندە مێیەتیی لێ بووبوو بەنەخش، پیاوم دەویست خۆی لەبەر بگرێ.

– بەدووی کەوە شەرمین، بەرەو زۆنگەکە دەڕوا، هەر بیگاتێ لە دەست دەچێ.

شەرمین هەستی کرد باڵندەی بریندار هەڵپە و حەلوەلای ئەوەیەتی خۆ لە چاڵێکی بەرین قوتار کا. بازدی دا نێو چاڵەکە لە باڵی گرت. خوێناوی بوو.

ئەوجا عەدنان بەهەڵەداوان هات، لەشی هێندە گەرم داهاتبوو، ئارەقە بەنێوچاوانیدا ڕێچکەی بەستبوو. تیتکی کاکۆڵەکەی بەسەر هەنیەیدا بەربووبووەوە، تەڕ بووبوو. کاتێکی گەیشتە سەری هەناسەی سوار بووبوو. شەرمین باڵندەی بەهێواشی بەدیواری چاڵەکەوە پەسارد.

شەرمین بەکاوەخۆ چاوی نووقاند، هیچ جۆرە ناقایلییەکی دەرنەبڕی. ئێکجار جوان بوو. پێ و پووزی رووتن.

سینگ و زۆپ، جووتێ مەمکی قوتی وەک گومەز هەڵتۆقیوی بەسەرەوە نیشتووەتەوە. عەدنان بەجارێ سەرسام بوو. بوو بەئینسانێکی سەیر. برسێتی بەرەو چلێسیی ڕادەپێچا. جوانییەکەی لەوەدا نەبوو، لە تێرخواردن نەدەهات. پیاوم دەویست خۆی لەبەر ڕاگرێ.

چەندی وەخت پێ چوو. چەندی پێ نەچوو، بۆ خۆشیان نەیانزانی.

شەرمین هەڵستا خۆی هیشک کردەوە، نەختێ تەڕ بووبوو. ئەو دەستەی بەخوێنی باڵدارە خوێناوییەکە خوێناوی بووبوو جارێکی دیکەش بەخوێنێکی کزری کچێنی خوێناوی بووەوە.

عەدنان لە گەڕانەوەدا، باڵدارەکەی بەدەستەوە بوو، لە گیانەڵا و دواهەناسەی سەرە مەرگدا بوو. هەردوو چاوی پڕ بووبوون لە فرمێسک،

هاواری کرد:

– هەڵەیەکی تا بڵێی پڕ لە شەرمەزاری بوو. نازانم چۆنت بیانگە بۆ بێنمەوە شەرمین. شتێ بووی پیاوم دەویست خۆی لەبەرت ڕاگرێ. بەڕاستی لەوەی ڕووی دا، زۆر نیگەران و خەمناکم، هەرگیز بەتەنیات ناهێڵمەوە.

– ئەوەی ڕووی دا، هەرچییەک بێ، ئەمڕۆ ڕووی نەدایە، ڕۆژێ لە ڕۆژان هەر ڕووی دەدا. بەختەوەریش لەوەدایە لەگەڵ یەکێکدا ڕووبدا کە حەزی لێ دەکەین. بەخەم و پەژارەوە مەتلێوە، خۆت ئازار مەدە.

باوکە لە سەرڕا دەیڕوانییە باڵندەکە، گوتی:

– قازە کێویلەیە، ڕەنگی قاوەییە. وا پێ دەچێ هی وڵاتی دوور بێ، تەرە بووبێ. ئەی ئەو خوێنە چییە بەدەستتەوە شەرمین؟ شەرمینترووکە بزەیەکی هاتێ، گوتی:

– خوێنی باڵندە کێویلەکەیە گەورەم. باڵی برینێکی گەورەی پێوەیە. ساچمەکە بەر باڵی کەوتووە.

***

هەرچی بەڵێن و گفتی هەبوون، سەرلەبەر، وەک گەڵای پایز چۆن هەڵدەوەرێ، ئاوها هەڵوەرین. ڕەشەبا سەرلەنوێ بەڕوویدا هەڵی کردەوە. دەبێ ئەوەی دایکی ویستبووی بەجێی بێنێ.

– دەبێ ببم بەهونەرمەندێکی گەورە شەرمین. دەبێ لە بارودۆخەکەم بگەی. ئەمن لەسەر لێواری (مەرگ یا داهێنان)دام. دەتەوێ بمرم.

– نەء، دیارە نەء.

– کەواتا دەبێ خۆم لە هەڵدێری مەرگ ڕزگارکەم، دەڕۆم، ئاوارەبوون لەحنەتێکی هەتاهەتایە، لە بەختانمە، لە دایکمەوەم بەمیرات بۆ ماوەتەوە، تا مرد، لە هیچ شوێنێ نەسرەوت، تا مەرگ بۆ خۆی بردییەوە.

– جا بۆ کوێ؟

– دووگیانی، شەرمین؟

– ئەرێ، دووگیانی چی؟ من خۆم سستەر بووم، لێی دەزانم.

زەردەیەکی بەگریەوەی هاتێ، گوتی:

– دەی کەوایە، چی ڕێگەی ڕۆیشتنێی لێ گرتووی. بۆ نارۆی، برۆ، ئەو ئازارە لە کۆڵە خۆت کەوە، بەڵام بۆ کوێ؟

– بۆ ئیسپانیا. نیازم وایە ئەم جارە قەدەرێ لە ئیشبیلییە بمێنمەوە. لە باوکم دڵنیا دەبم. مادامێکی تۆی لەتەک بی، سەرئاسوودە دەبم. بەتەنگەوە نایەم.

– جا بۆ ئیشبیلیە؟

– قەرەجێکی پیری لێیە، دەیناسم، نۆرییە بەختم، هەویایەکی گەورە بۆ ئافرەتێکی گەورەی بەنامێ بەدی دێنم. نازانم چۆنی زانی شەرمین؟

– جا خۆ شتێکی هێند ناخواسایی نەگوتووە. کێهە لاو بگری، لەو تەمەنەدا ئافرەتێکی جوانی لە مێشکدا نییە.

– وێڕای ئەوەش بەدووری نازانم پێشبینییەکەی بەڕاست بگەرێ. جا کاتێکی دەگەڕێمەوە، دەبێ چاوەنۆڕ کەی، هەرچەندیشم پێ بچێ، دەگەڕێمەوە شتێ لەگەڵ خۆمدا دێنمەوە، دەستی ڕۆژگاری هەرگیز بەخراپە نەگاتێ. نیگارێکی بێ هاوتا و نەمر.

– لە سینگ و مەمکی ئافرەتێکی دەگەڕێی، عەدنان، نیگاری بکێشی بەهیواشی کراسەکەی لە سینگ و مەمکی خۆ داماڵی، بەرکەوە مەمک بەندەکەی لە مەمکۆڵانی ترازاند:

– ئەمەت بەدڵ نییە؟

عەدنان بە حەپەساوی حەپەسا، هەردوو چاوی پێوە دوورا، دەستی بەگریانێ کرد. هەر کە شەرمین سینگ و مەمکی داپۆشییەوە سوور زانی بەداویەوە بووە. لە هەموو جارێکی دیکەی پڕ لە بەختەوەری بۆ گڕ لە هەناو بەربووتر بوو، بەڵام ناهومێدی بەهێزتر بوو. بۆ شەوی پاشێ هەڵات، فڕی بۆ ئیسپانیا. لە کاغەزێکی پڕ شەڕەپشیلەی فرمێسکاویی بەولاوە چیی تری بۆ

بەجێ نەهێشت.

کوڵ و کەسەر سەری دنیای لێ وێک هێنایەوە، هەرلەو ڕۆژەوەی عەدنان بۆی دەرچوو پیاوە کەنەفتەکە بەری ئاسمانی شادمانیی، هەور و هەڵای خەم و خەفەت دایگرت. نە ڕۆژی ڕۆژ بوو، نەشەوی شەو. ڕۆژ نەبوو یەک لە چەتیوەکانی، یا هەرتکیان بەسەر ماڵیدا نەدەن، هەرچی خوا هەڵی نەگرێ لە قسەی ڕەق و درشت و ناشایستە بەبەر گوێیدا نەدەن.

– تۆیش وەک هەتیوە گەمژەکەت بەداوی ئەشقی ئەم چەتیوە هیچ و پووچەوە بووی. ئەتۆ کێت پێ دەڵێن و ئەو کێی پێ دەڵێن؟ تۆیەکی جەودەت وەهبی ئەندازیاری هونەرمەند و زەبربەدەست، ئەندازیاری بەناوبانگ و لێهاتوو. ئەو کێیە؟

– ئێمە دەزانین بەداوەوە بووی، بەداوەوەبوویش دەبێ لە چەنگاڵ و چنگوڕکی چەپەڵ قوتارکرێ.

کابرا وەک هەورەتریشقە بەڕوویاندا تەقییەوە:

– بیبڕەوە سوعاد. بیبڕەوە، ڕک و کینەی دڵت لە هەموو بەهایەکی داشۆریوی، کردوویتی بەشتێکی زۆر بەدفەڕ و هیچ و پووچ. بەڕاستی زۆرم پێ ناخۆشە ئاوهات لێ بەسەرهاتووە.

– ڕک و کینە؟ ڕک و کینە لە کێ؟ لەو قەرەواشە هەرچی و پەرچییە؟

– بەسی تیروتوانج تێ سرەوێنە سوعاد. زارپیس، دەڵێم بەسیەتی. چاوقایمی و شووڵ لێ هەڵکێشان ئێکجار بەم ڕادەیە، بەسە.

سوهەیلە بەلای خوشکیدا دایتاشی و هەڵی دایە:

– ئاوها، دەتەوێ بەقیژ و هۆڕ هەڵەمان لێ بەڕاست بگۆڕی؟ من سوهەیلەم، سوهەیلە، تۆ قسە لەگەڵ من بکە. خشڵ و زێڕەکانی دایکم کوا؟ ئەو مانگا لادێییە ناحەزە قووتی دان؟

– گوتم بەسە، دەنا بەخۆپەلکێش کردنەوە خۆم دەگەیێنمە تەلەفۆنەکە، داوای پۆلیس دەکەم.

– له خـۆتی دوورخــەوە، لەو مـاڵـەی دوورخـەوە، ئەگـینا بـەڵایەکی ناگـەهانی بەسەردێ.

– بەڵێ، سـا بەوەندە سوێند و قـورئانه ونجڕونجـڕی دەکەین. چمـا هـاسـانـتر هـەیە بۆ مە. ئەگەر سەری تۆش لە بەڵای قوتاربێ، سەری هـەتیوە کەودەنەکەتی لێ قوتار نابێ.

– کچی هـەی ناکـەسی دەمەوەر. تو خوا کێ دەڵێ ئەم کـاژە نەرم و نیانە ئەو هـەموو ژەهروتاڵاوەی لە بندایە. لێرە لاکەوە، وەدەرکـەوە دەی. کیژێ وەدەرکەوە ســوهـەیلـە، باوکی تۆ لە مـاڵـە نەبووە و نیـیـە. ســوعـاد تۆیش بۆ دەرەوە، بڕۆ، حەوت پەڵت لە دوو. هـەی شملّی شەڕی خێزانە چاکەکە.

گوڕی وەخـۆ دا، بەرەو تەلەفۆنەکە خۆ پـەلکێش کـا، کیـژەکـان وەدەرکـەوتن. کابرا نەسرەوت، تا گوڕەی ئۆتۆمبیلەکەی بەر گوێ کەوت.

دایکێشا هـەیپێی لێ کرد.

سـەرلـە ئێـوارە زۆر کـەشــەنگ و شـەکـەت دیار بوو، زۆریش کـزبوو، دەتگوت سـاڵێکی ڕەبەقــە بەڕۆژووە و لە خــواردن مـانی گـرتووە. کـە ئـەمـە ڕووی دا، شــەرمـین لە ژوورەکـەیدا دەرکــەی ژوورێی لە ناوەوە لـە خـۆ پێـوەدا بوو. بەڵام گـوێی لە زۆربەی شــەڕ و هـەراکــە بوو، بیـری کــردەوە، لەگـەڵ ئەو بـارودۆخــە نوێیەدا چۆن هـەڵسووڕێ.

بە کووپێ شیرەوە، بە زەردەخەنەیەکی ناسکەوە، وەژوور کەوت، گوتی:

– برسیت نییە گەورەم؟ وا کووپێ شیری گەرم و گوڕم بۆ هێنای.

– کـەمێکم برسـییـە. ئەرێ تۆ گـوێت لەو هـەمـوو بەزمـە بـوو، لەگەڵ ئەو دوو چەتیـوە دڵڕەشــانـەدا ڕووی دا؟ کـوڕە خــۆ هـەر بەجــارێ تاڵاوی دنیـایـان پێ دەرخوارد دام. دوو توخمی خراپ لە پشـتێکی پاک و ڕەسـەن کەوتوونەوە. ئەوە دایکیشیان هـەر وا بوو. ئای لەو ئاکار درشتییە.

قـومێکی گەورەی لە شیـرەکە دا. لە پاشـان داوای پیـاڵەیێک شـەرابی کـرد، لەو شەرابەی کە بەسـەر خەم و پەژارەدا زاڵ نەدەبوو، دەیخواردەوە.

– بەتەواوەتی گوێت لە هەموو شتێ بوو شەرمین؟

ڕاست برۆ.

– نەخێر، هەرکە هاتن، وام بەچاک زانی ژوورەکەم بەجێ بێڵم، چووم بۆ کن ژنی باخەوانەکە، یەک دوو ورتەی لەگەڵدا بکەم. ترسام پێت وابێ ڕۆژگار وای لێ کردبم خۆم لێ بەزلتر زانیبێ.

– تو خوا هەر بەڕاستی هەر لەوێ بووی شەرمین؟

– جا بۆچی بڕوام پێ ناکەی گەورەم؟

– کەواتا شەڕوهەرایەکی توند و تیژ ڕووی دا، دەک بەڵام لە سۆرە و تۆرەی وا دا کە لە ئازاردان و خراپە بەولاوە چیی دیکەیان لێ ناوەشێتەوە.

– ئای کە چەند بەداخەوەم، گەورەم، لەو دەمی تۆ ئەو هەموو شتە ناخۆشانەت لێ دەقەومێن، من ئەو وەختە هەواڵێکی خۆش وەردەگرم، لەمێژە چاوەنۆڕی بیستنێی دەکەم.

– ئەو هەواڵە چاوەنۆڕکراوە چییە شەرمین؟

– نامەیەکم لە ئامینەی خوشکمەوە بۆ هاتووە، دەڵێ لە گوندێکی نزیکی ماڵی پلکم بەفێرکار دامەزراوە، بۆی نووسیوم، بەپەرۆشەوە داوای ئەوەم لێ دەکا لەگەڵیدا بم. دەمێکە خەونم بەم ڕۆژەوە دەدیت، خوا کردی، وا بەدی هات خەونەکەم. ئیشارەتێکیشی بەوە کردووە، کە ڕەنگە شوو بەفێرکارێ بکا لەو گوندە. لەوە خۆشتر هەیە گەورەم. ئەدی ئەو هەمووە دڵ خۆش ناکا، گەورەم؟

– نەخێر، نەوەڵا، دڵم خۆش ناکا، ئەمە واتا ئەتۆ گوێت لەو هەموو قسانە بوو ئەو دوو چەتیوە دڵڕەشانە لەبارەوەیان گوتی. ئەتۆیش ئەو درۆیەت بۆیە هەڵبەست.

– ئەمەیش هەر لەبەر چاوی تۆ دەکەم، گەورەم. من نامەوێ لە نێوچاوانی منەوە ناکۆکی و دووبەرەکی ئەو خێزانە چکۆڵەیە لەبەر یەک هەڵوەشێنێتەوە.

پیاوەکە بەکوڵ و کەسەرەوە ئاخێکی هەڵکێشا، گوتی:

– فرێکی دیکەم لەو شەرابە وێ دە شەرمین. وەی لەوی کوێرەوەرییێ،

وەنەبێ یەکە یەکەش داباریێ.

کە جامەکەی بە بەتاڵی وێ دایەوە، گوتی:

– کلیلەکە هەڵگرە، خەزنەکە بکەوە شەرمین، زووکە خێرا، کێهە دەسەوارە پارەت بەدەستەوە هات دەری بێنە.

شەرمین دەسەوارەیێ پارەی هێنا. پیاوە سەرێکی ڕاوەشاند، گوتی:

– هی گەورەتر هەن، بەڵام چ دەڵێی، بەخت ئەوەی پێ بە نسیب کردی. ئەمن نازانم ئەو دەسەوارەیە چەندە. چم دەسەڵاتە، هەر وەختە هەڵکوڕووزێم لە خەم و خەفەتان، چۆن دەڕۆی.

– ئەگەر ئیزنم بدەی سبەینێ بڕۆم، بە ژنە باخەوانەکە دەڵێم ئاگای لێت بێ، تا یەک لە کیژەکانت دێتە خزمەت.

– کەواتا گوێت لە هەموو شتێ بوو، کەسیش نییە وەک تۆ خزمەتم بکا، شەرمین. دە کەوایە، ئەو سندووقە چکۆڵەیەم بۆ بێنە، لە نهۆمی خوارەوەی قاسەکەدایە.

هەر کە سندوقچەکەی کردەوە لەگەڵ بەردە گرانبایی و خشڵ و زێڕەکاندا دەم و چاوی لەبەر ڕووناکییەکەی بریسکایەوە، چنگێکی بەگەردانە زێڕێکدا کرد، پێچکەکەی ئەڵمازێکی دڵ بوو. گوتی:

– ئەمەیش بۆ تۆ. چەندم حەز دەکرد، هەر هەمووی بۆ تۆ بوایە، ئەو کوڕە کەساسەی تا ئێستایش بەولاتاندا بەدوای خەونێکی پیاوهەڵخەڵەتێنی دوورەوە وێڵە هانیبایتی. تکام وایە ئەم گەردانەیە بۆ یادگار هەڵگری و خۆتی وەک هەموو کیژێکی جوان پێ بڕازێنیتەوە، وەک هەموو کیژێکی حەز دەکا جوانتر بنوێنێ. هەر کاتێکیش لێی بێزار بووی، یا تووشی تەنگانەیەک هاتی، ئەمە ئەڵمازە، سامانێکی گەورە دەکا، لە شوێنێکی ئەمینی قایم کە. نەکەی لە دوعاخوازیدا، وشەی ماڵاواییم لێ بکەی.

دەم و چاوی نوقمی ژێر سەرینەکەی کرد و فرمێسک بەهەردوو چاویدا ڕێچکەی بەست و بەبێ دەنگییەوە دایە کوڵی گریانێ.

٧

ئاخر و ئۆخری زستانیش تەواو بوو، بەهار هات پاشان بەهاریش بەسەرچوو، هاوین هات بەنیوە بوو، ئەویش چوو.

ئۆتۆمبیلێکی چکۆڵە پاڵی بە شۆسەوە دا، تۆز و خۆڵی سەفەرێکی دوور و درێژی بەسەرەوە نیشتبوو. لاوێکی لێ هاتە خوار بەتاو خۆی کرد بەژوورا، دەتگوت بۆمبایە.

– ئەوەتام باوە، وا گەڕامەوە. گەڕامەوە، ئیدی قەت ناگەڕێمەوە. بڕیارم دا لێرە دای کوتم و ئیدی ببڕێتەوە.

– ئەوە تۆی عەدنان، کەنگێ گەڕایتەوە، کوڕم؟

– هەر ئێستاکانێ باوە، دەبوو بگەڕێمەوە. باشە ئەتۆ چۆنی، چت بەسەرهاتووە؟ ئەوەندە ساڵەت قەت لێ دوور نەکەوتوومەوە، کاتێ ئێرەم بەجێ هێشت وا نەبوو، شەرمین خزمەتی نەکردی، کیژێکی چاکی وا قەت ناشێ ئەوە بکا، زۆری ڕێز لێ دەگرتی.

– یەک لە خوشکەکانت خزمەتم دەکا ئەو ڕۆژانە.

– ئەوە لە کەنگێوە ڕووی دا باوە؟

– ئەوە چەند مانگێ دەبێ، هەر پاش سەفەری تۆ بەچەند ڕۆژێ.

– شەرمین ڕۆیشت.

– ڕۆیشت، بەڕەزامەندی ڕۆیی، کوڕم. تکا وایە ئەم خەمە تازەیە نەتهەژێنێ. زۆری دڵ پێ سووتام، چ بکەم، دامە باری بردەباری، ئەوەتا دەژیم، بەخۆت دەبینی.

– زۆر خراتری باوە.

– ئەمە ئەوپەڕی دەسکەوتم کوڕم. نەدەبوو دایکت لەو سەفەرە لەحنەتییەدا بمرێ. نەدەبوو بۆ کوێرەوەریم بەجێ بێڵێ.

سوهەیلە بەڕەنگ و ڕوویەکی خۆش و پڕ لە بەشارەتەوە وەژوورکەوت، دەستی بۆ درێژ کرد باوەشی پێدا بکا، کوڕە خۆی کێشایەوە.

– کەواتا تۆ، لە ناوچاوانی تۆوەیە، سوهەیلە، خوشکی بەدفەڕ. ئەو داروەکازەی پشتم پێ قایم بوو، لە دەستت دام، ئەمن بەتەمای وەبووم بەو داروەکازەی ماڵێکی بەختەوەر بۆ خۆم پێکەوە نێم، لاکەوە لەپێش چاوم، لاکەوە، هەی ماری زەرد.

سەرلەئێوارە، لەمەڕ گەڕانەوە و سونگەی گەڕانەوەی لەگەڵ باویدا قسەی کرد.

– لێزانە قەرەجە پیرەکەی دۆستم پێی گوتم لە ئیشبیلیە، بگەڕێوە وڵاتی خۆت، ئەتۆ لە کارێکی پێت جێبەجێ ناکرێ دەگەڕێی، بەڵام یەکت لەپشت هەڵدەکەوێ، لە کیژێکی حەزی لێتە، ئەو جێبەجێی دەکا، لە وڵات و زێدی خۆت.

منیش لەبەر ئەوە وا گەڕامەوە، لەبەر ئەو گەڕامەوە، ئیدی ناگەڕێمەوە، گوتم، بەڵام هەر لە سبەینێ زووتر نییە.

– ئەدی تۆ نەتگوت لەگەڵماندا دەمێنییەوە؟

جارێکی دیکە دەگەڕێمەوە.

– بەڵێ، بەڵان، تا نەیدۆزمەوە، نەء. باشە چ ناوونیشانێ، شتێکی بەجێ نەهێشت بۆ کوێ چوو، لە کوێ دەبێ؟

– نەخێر کوڕم، تەنیا هەر ئەوەندەی گوت، کە گۆیا دەچێ لەگەڵ خوشکەکەیدا دەژی. ئیللەڵڵا و بڕایەوە.

## ٨

هەستم کرد لەنێو باگەڕ و باهۆزە کرێوەیەکدام، لەسەرما چۆقەی ددانم دێ، وەخەبەر هاتم، لە پەنجەرەیڕا نۆڕیم، پەردەکانی بەتاک بوو، زانیم لاپەڕەیەکی نوێ لەپڕ و بەوپەڕی دڵڕەقییەوە کرایەوە. سەرماوسۆڵە بەهەموو زەبر و زەنگێکییەوە شالاوی هێنا. هەور و هەلایەکەی دوێنێ خەست بووبووەوە، ڕەنگی کەوە بووبووەوە، بارانی دنیای بەکۆڵەوە بوو، دەبێ دوێ شەوێ هەمووی هەڵڕشتبێ. هەر لەسەر جێگەکەمەوە وەک هەموو سبەینانێ، سەرنجێکم دا.

– سلاو. سوورک کێوە دۆستەکە، وا دیارە بەو زووانە لێک دادەبڕێین. ئەتۆ زۆر گەورەی، هەر خۆت خاوەن ڕۆژگاری دوور و درێژیت و تەنیا هەر لە خۆت دێ زەبر و زەنگی زستان بچێژی، هەر تۆ توان و گوڕی ئەوەت هەیە.

کاتێکی بەفر تارای سپیت بەسەر هەنییەی بەرین و هەراودا دەگرێ، بەندەن و ترۆپک و لووتکە و کەل و کەڵوەز و نزار و داوێنت دادەپۆشێ، ڕەنگە سووره تاڵەکەت لێ وەشێرێ، دەبێ بۆی دەرچم، کێ دەڵێ ساڵێکی تر وەیەک دەگەینەوە. خۆ هەرچی، تۆی چیای دەوران و ڕۆژگارانی سەر دنیا، ئای کە یار و یاوەرانت زۆر دەبن هەتا دێ. هێندەی هەتاهەتاییی، هێندەی نەمریت تاسە دەکەم.

سلاو ڕۆژ باش. تا مالاوایی دێ.

لەسەر تەختەکە هاتمە خوار، پاڵتۆیەکەم بەسەر شانمدا دا. پاڵتۆیەکەم کوڵکن بوو، ئاغڵەبە کە بۆ ئەم ناوە دەهاتم دەمهێنا.

گوتم:

– چاک وایە چاشتەکەم لە ژووری بەردەستییە کەڵەگەتەکەی ئوتێلی بکەم،

کـابرای بەردەسـتی زۆری حـەز لە قـسـان دەکـرد، وەڕەزیی بەقـسـان خـاو دەکردەوە، ئیش و کاری لەکۆڵ بووبووەوە، ئوتێل چۆل و هۆل بوو.

ژوورێکـی چکۆلانەی بـۆ هـاوێر کـردبوو، چەپـەک، کـەسـی بەسـەرەوە نـەبوو، هـاتوچۆی بەسـەرەوە نەبوو. ئای چەنـد خۆش بوو. ئێسـتـا هێند گـەرم و گـوڕە. کابرا لەڕ و لاوازە، بەسـەرمـا زۆر قـەڵس دەبێ. نۆڕیم دەرکـە داخـراوە، لێم دا، بەهێواشییەکەوە، یەک دوو ترپەم لێوە هێنا. گوێم لێ بوو، گوتی:

– فـەرمـوو گـەورەم. کـە وەژوور کـەوتم، دیتم خـۆی لە شـاڵینەیێکی خـوریی ئەستوورەوە پێچاوە، ڕووی لە شیوەکە کردووە، خەمگین لەو دنیایە دەڕوانێ.

دانیشتم.

– ژوورەکەت گەرم و گوڕە، هەروایشم دەزانی.

– هـاوڕێیـەکـەم حـەوتوویەکـە چوویتـەوە مـاڵە خـۆی، ئوتێلەکـە لەو ڕۆژەوە داخراوە.

– هاوڕێیەکەم زۆرم برسییە زۆر، ئێکجار زۆرم برسییە.

– هەر ئێستا چاشتم لەگەڵ دەکەی، ئەوە یەکەم جارە پێکەوە نان دەخۆین.

– منیش هێشتا چاشتم نەکردووە. بەو زووانە ئۆغر دەکەی؟

– ئەگەر بەفرەکە باری.

– هەی لەو بەڵێنە سەیرە، گریمان ساڵێ لە سالان بەفر نەباری.

– لێرە لە کن تۆ دەمێنمەوە.

– دەی خـوایە، بیکە بەگـەورەییی خـۆت، تەنیـا تکایەکم لێ قـبـووڵ کـە، ئەوساڵەکە بەفر مەبارێنە.

گوێمان لە تەقەی دەرکە بوو.

گوتم:

– دەبێ کێ بێ؟

– کێیە؟ ئەدی کابرای دوێنێت لە بیر چووەوە گەورەم، ئەوی لە باڵکۆنەکەدا

پێکەوە شووشـەیێ شـەرابتـان لـەگەڵدا خـواردەوە و بـەدوور و درێژیی لەگـەڵ ئاخاوتی.

– فەرموو کورِم.

– عەدنان خۆی بەپاڵتۆیەکی گرانبەهاوە پێچابوو، وەژوور کەوت، گوتی:

– لە ژوورەکەتم نەدیتەوە.

– دانیشە کورِەکەم، چاشتی سبەینێمان لەگەڵدا بکە.

– ئاخر لەسەر بەڵێنین. ئەی بەڵێنی گەشتێکی دوور و درێژت نەدامێ؟

– ڕاست دەکەی.

– ئەمن ئامادە و تەیارم، گەورەم.

– جا بەم تەڕ و تووشییە؟

– دوێنـێ، هـەور و هـەڵاکـەی لـەمـڕۆکـە زۆر خـەست و خـۆڵتـر بـوو، وێڕای ئەوەیش بەڵێنی گەشتەکەت دانێ.

– ئەمن لـەبەر ئەوەی بۆی هـاتـووم، لێـرەم، دەنا کـارم چ بوو؟ هـەر کـاتێکی، بێ لێکۆڵینەوە، بەفیرِۆ بچێ بەرەو نەمانم هەڵدەدێرێ.

– کورِم. خـۆ تۆ بۆ خۆت دەبینی، سەفـەر و گەشت سەختـە، ئەم ژوورە گەرم و گورِە بەجێ هێشـتنەیش هـەر بەولاوەترەوە. پیاو ژووری وا چۆن دڵی دەهێنێ بەجێی بێڵی.

ئەتۆ هونەرمـەندی، دە کەوایە، فـەرمـوو، وەرە لەم پەنجـەرەیەوە تەمـاشـاکە، بزانە خـوا چ جوانیـیـەکی بە سـامی گـووراندووە، بڕوانە چ ئیـجـاتکارییـەکی نواندووە.

سپاسی کردم، گوتی:

– کەواتا دەبێ هـەر بڕۆم، دەبێ بەتەنیا بڕۆم.

ویسـتم بەری لێ بگرم نەڕوا، بەتوندی گوتی، هـەر دەڕۆم. باوکیشم ویسـتی نەهێڵێ بڕۆم، چەندی کرد و کۆشـا، بەو پەککەوتەیی و گۆجییـەیەوە بەخشکە

هات بۆ کنم، توند گرتمی بەجێی نەهێڵم، بەڵام ئەوەتا وا لێرەم دەبینییەوە.

– دەبێ برۆم لێی بگەڕێم، لە هەرکوێیەکی بێ بیدۆزمەوە.

بەردەستە کەڵەگەتەکە تێ هەڵچوو، پیاڵە بەتاڵەکەی لەولاوە دانا، پرسی:

– ئاغا بەو تەڕوتووشی و ناوەختە لە چ دەگەڕێ؟

تەماشایەکی عەدنانم کرد، وەک یەکێ شتێکی لێ بپرسێ تێمەڕوانی، پاشانەکێ گوتم:

– لە کیژێ دەگەڕێ وەختی خۆی لەگەڵیدا بوو، بەجێی هێشت، تا گەڕایەوە نەماوە.

– جا کیژی وا، شایستەی ئەو هەموو دڵپاکییەیە؟

کوڕە وەک فیشەکە شێتە هەڵچوو:

– ئەمن ئەو پارسەنگ هاویشتنە سەر قسانەم، بەو چاوقایمییەوە قبووڵ نییە.

– ئەمن پیاوم و لەگەڵ پیاودا قسان دەکەم، بەردەستی ئوتێلەکە نیم لێرە. تا زستان نووزەی لێ دەبڕێ، ئەمنم ئاغای ئێرە. ئەگەر نیگەرانیشم کردی، عوزرت لێ دەخوازمەوە، بمبەخشە.

دەبوو ئەمنیش لەسەر هەڵدەمێ، گوتم:

– ئەمن چیی وام لێ نەزانی کوڕی خۆم. چۆن چۆنییە، ناوونیشانی؟بەچدا دەناسرێتەوە؟

سەرە قژبژ و تێکچووەکەی بەدیواریدا دا لە تووڕەییيان، گوتی:

– کیژێکی بەژن شووشی، قشیتلانەی، نەشمیلانەیە، قژە پێل پێلەکانی لە گوێن پێلە دەریایە، سوورە وەک بڵێسە و گڕ و هالاو.

– ئەدی نێوی کوڕی خۆم، مادامێکی دوو بەدوو لێی دەگەڕێین؟

هێندێ قۆرت و گریی بەرزاری کەوت، پاشانەکێ گوتی:

– نێوی شەرمینە گەورەم، شەرمین.

بەردەستی تاین لەپڕ ڕاست بووەوە، سووک لە ژوورەکە وەدەرکەوت. زۆری نەخایاند. پاش قەدەرێ گەڕایەوە. پارچە کاغەزێکی بەدەستەوە بوو. بەرەو ڕووی هات، پرسی:

– نێوی شەرمین بوو گەورەم؟ شەرمینی جوامێر عەبدوڵڵا؟

عەدنان بەهەناوی گڕ تێ بەربووەوە قریواندی:

– نێوەکەییت چۆن بەو خشتییە دیتەوە؟

کابرای بەردەست بە خۆ لە پرسیارەکەی عەدنان نەبانکردنەوە، ئاوڕێکی لە من دایەوە:

– نیشتەنییەکەی ژووره ژمارە –١٢ەکەی نهۆمەکەی خۆتت لە بیرە گەورەم؟ نەبوو، حەوتوویێ، لێرە بۆ وەخت کوشتن مایەوە، کیژە بەژن شووشە، قژ سوورە وەک گڕ ئاگر هەڵایساوەکەت بەبیر دێتەوە؟

– بەڵێ، بەبیرم دێتەوە.

– ئەوی پێش هاتنی ئەم ئاغا بەرێزە بەرۆژێ ڕۆیشت؟

– بەڵێ، لەبیرمە. دەی جا چ بوو؟

– نێوی شەرمین بوو، شەرمین جوامێر عەبدوڵڵا، ئەوهای نێوی خۆی لە دەفتەرەکەدا نووسیوە.

عەدنان وەک پێلێکی بەلووزەو پڕی دایێ، باوەشی پێدا کرد، یەک دوو جاری وەخولاند، ئەوجا داینایەوە.

– هۆ ئینسانە گەورەکە، هۆ چارەنووسە بۆ بە برزە هاتووەکەم، ناونیشانەکەی نازانی، نازانی کە لە ئۆدەکە وەدەرکەوت بۆ کوێ چوو؟

بەهێمنییەکی لە سەرکەوتووانددا دەبیندرێ و بەوپەڕی بێ پەروایییەوە گوتی:

– بەڵێ. ناوونیشانەکەیشی لە دەفتەردا نووسراوە. لە قەزاوە بۆ چەند ڕۆژێ، هاتبوو، بحەسێتەوە لێرە. بۆ ئەوێیش گەڕایەوە. شوێنەکەی لێرەوە زۆر

دوور نییە، بڕوانە، هەر لە پشت ئەو کەژەوەیە، هاها ڕەش دەچێتەوە، کەژە درێژ داکشاوەکە. ڕێگەکەیشی خۆشە.

عەدنان هەرچی پارە و پوول لە جزدانەکەی هەبوو، سەرلەبەری لەسەر پێڕکی ئوتێلەکە هەڵڕشت، گوتی:

– فەرموو گەورەم، وا چاوەڕوانتم، تا خۆ تەیار دەکەی.

گوتم:

– جا بەم ناوەختە؟ بەم تەڕ و تووشییە؟

گوتی:

– ئەی بێ قەزابی، جا ئاو و هەوا لەوە خۆشتر و لەبارتر دەبێ. هەرچییەکی تێدایە هی بەهەشتی یەزدانە. دە ئەگەر وایە، با خۆم بەتەنێ بڕۆم.

گوتم:

– بمبەخشە، کوڕم، ئەمن بەڵێنم دایتێ، لە وەختێکی دیکەدات لەگەڵ بێم.

لێم نزیک بووەوە، بەگەرمییەوە باوەشی پێدا کردم، گوتی:

– بمبەخشە، کوڕم، ئەمن بەڵێنم دایتێ، لە وەختێکی کە ئەویشت لەگەڵدا بێ.

– بێگومان لەگەڵمدا دەبێ.

بەرەو کابرای بەردەست چوو، باوەشی پێدا کرد، کابرا واقی وڕمابوو، ئەوجا وەدەرکەوت و دەرکەی لەپاشەوە پێوە دا.

قەدەرێ بێ دەنگ بووین، ئەوجا گوتی:

– کەساسە، دەبێ چەندی کۆسپ و هەڵەمووت تووش بێ لەڕێیێ. وا بەفریش سەر ترۆپک و لووتکەی کەژ و کێوانی سپی کرد.

نۆڕیم چیای سوورک هەوەڵ کەژێ بوو خەڵاتە بەفری خۆی وەردەگرت، ڕاست بوومەوە، ئەوەندی خەیاڵ بفەرمووێ دڵشاد و کەیفساز بووم، گوتم:

– ئەمنیش وادەی خۆم هات، لەمێژە لێرەم، ئەوساڵەکە زۆر مامەوە، دەبێ

ئەمنیش خۆ تەیارکەم، بگەڕێمەوە.

کابرای بەردەست هەناسەیەکی ساردی هەڵکێشا، چەندی چاو هەتەر دەکا نواڕی، گوتی:

– پاش ڕۆیشتنی تۆ تەنیایی دێ، ئەو وەڕەزی و بێزارییەی لە یەکنەوازیی شتان دێتە گۆڕێ، ئەوەی هەر لە مەرگ دەچێ. بڕۆ گەورەم، بەهەویام بگەڕێیەوە.

کاتێکی پاش دوو ڕۆژان بەفر لێی کردەوە و ئاسمان خەڵاتی خۆرەتاوی گەرم و گوڕ و بەپرشنگی بەزەوی بەخشی و بەنوخشەی زستانی بەفراوییەوە چریسکایەوە، ئوتێلەکەم بەجێ هێشت، فرمێسک دوو جۆگەلەی درێژی بەدەم و چاوی بەردەستە دۆستەکەدا بەستبوو[1].

---

١ مامۆستا عەبدولەجید لوتفی، کاتێکی ڕۆمانەکەیم بەکوردی دەکرد، پاشکۆیەکی وێ دام. بیاوێمە سەری، پاش وتوویژێ هاتە سەر ئەوە، هیچی لێ زیاد نەکرێ چاترە. جا ئەگەر، ئەمە دنیایە، هاتو ئەو پاشکۆیە بەعەرەبییەکە بڵاوکرایەوە، شتێکی سەیر نەبێ. وەرگێڕ